ئەڵقەی یازدەهەم

زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان



# مەلای گەورەی کۆیە و تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێک

عەلی باپیر

ناوی کتێب: مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێک
نوسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نەخشەشازی ناوەوە: عزالدین محمد عمر
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك — ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٢٤)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێ دراوە

چاپکردنی ئەم شێوەی کتێبە کەمێ بە نسبەت گوێرەی
توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .
وە لە پێشتر بوو هیوام وابوو شێوەی چاپکردنێکی
وایان بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری
خوێنەرانی بێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر
دەکەم لە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ .
خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیشیان
بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

علی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله ومن والاه

بەندە (د. عەلی باپیر) ڕێ بە مامۆستا مخلص و

ئەو مافەی کە خۆم هەمە تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و پیتی زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

ع. عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦هـ

٢٠٠٥/٥/١٩

# نێـوەڕۆك

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ النحل ﴾

# پێشکەش بێ

بە هەموو ئەوانەی، کە هەوڵدەدەن بە قووڵیی لە کتێبی بەرێزو بە پێزی خوای پەروەردگار تێبگەن، تاکو بتوانن پێیەوە پابەند بن، پاشان بەهۆی پێوە پابەندبوونییەوە کامڵ ببن و تێبگەن.

# ئەم نامیلکەیە

ئەم نامیلکەیە دەقی ئەو وتارەیە، کە لە کۆڕێکدا بە ناوونیشانی ﴿مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك﴾دا لە ڕۆژی ٢٢/ ١٠/٢٠١٠ بەرامبەر ١٤ی ذوالقعدة ١٤٣١ی کۆچی لە هۆڵی سەنتەری حیکمە لە شاری هەولێر پێشکەش کراو پاش هێنرانە[1] سەر کاغەزو سووکە دەستکارییەك بەم شێوەیەی لێهاتوە.

شایانی باسیشە کە قسەکردن لەبارەی تەفسیرەکەی جەنابی مامۆستا موحەممەدی جەلیزادە، ناسراو بە (مەلای گەورە)وە، کارێکی ئاسان نیەو زۆر هەڵدەگرێ، بەڵام وەك گوتراوە: ((ئەوەی هەمووی ناکرێ، واز لە هەندێکیشی ناهێنرێ))، ئینجا منیش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە تەفسیرەکەی مەلای گەورەم لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندوتەوەو بە وردیی سەرنجم داوە، بۆیە دەتوانم بڵێم:

ئەم وتارە هەرچەندە لەچاو تەفسیرێکی دە (١٠) بەرگیدا کەم‌وکورتە، بەڵام تا ڕاددەیەکی باش جەوهەرو نێوەڕۆکی باس‌و بابەتەکانی خستۆتە ڕوو و، فیکرو تێگەیشتنی مەلای گەورە لە دوو توێی لێکدانەوەی مانای ئایەتەکانی قورئاندا، بۆ گەلێك بابەت‌و مەسەلەی گرنگ‌و هەستیار ڕوونکردۆتەوە.

---

١) لەلایەن برای بەڕێزو دڵسۆز کاك مەلا بیلال قەڵادزەیی بووە، خوا پاداشتی بداتەوە.

هیوادداریشم لە چاپی دووەمی تەفسیركەی مەلای گەورەدا سەرجەم ئەو تێبینیو سەرنجانەی، كە لەبارەی چۆنیەتی چاپكرانو دیزاینو...هتدی ئەم تەفسیرەدا خستوومانەتە ڕوو سوودیان لێوەربگیرێ[1].

**سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد ألا اله الا أنت أستغفرك وأتوب اليك**

٦ جمادي الاولى ١٤٣٢ ك

٩ نیسانی ٢٠١١ز

هەولێر



---

١) شایانی باسە كە برایانی نووسینگەی تەفسیر بۆیان باسكردم، كە كاتی خۆی ئەوان بەتەمای چاپكردنی تەفسیرەكەی جەنابی مەلای گەورە بوونو، زۆر بەشێوەیەكی ڕێكو پێك تایپو دیزایینیشیان كردووە، بەرگێكی جوانو جۆرە كاغەزێكی باشیان بۆ داناوە، بەڵام دوایی بەبێ ئاگاداری ئەوانو، ئاوا بە كەموكووڕییەوە چاپو بڵاوكراوەتەوە.

# دەستپێك

الحمدلله رب العالمين و صلى الله تعالى وسلم وبارك على حبيبنا و شفيعنا و قائدنا و مقتدانا محمد إمام المتقين وقائد المجاهدين وآله أجمعين من الصحب والقرابة والأزواج والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

بەڕێزان!

وەك لە ناوونیشانی کۆڕەکەماندا دیارە، خوا پشتیوان بێ بابەتەکەمان بریتیە لە باسی ئەو تەفسیرە ناوازەیەی، کە مامۆستای ناودار مامۆستا مەلا محمدی جەلیزادە ناسراو بە مەلای گەورە، نزیکەی (٧٠-٨٠) ساڵ لەمەوپێش دەستی پێکردوەو (٦٧) ساڵ لەمەوپێش تەواوی کردوە.

دیارە گەلی کورد هەر لەو ڕۆژەوە، کە خوا -سبحانه و تعالى- بەهرەمەندی کرد لە هیدایەتی ئیسلام، ڕۆڵی زۆری بینیوە لە خزمەتکردنی ئیسلامدا، هەروەك بەهرەی زۆریشی وەرگرتوە لە ئیسلام بۆ خۆپێگەیاندن‌و ناودارانێکی زۆرو زاناو پێشەوایانێکی زۆر لە باوەشی گەرمو پڕ سۆزی ئیسلامدا، لە قوتابخانەو خوێندنگاکانی شەریعەتدا، لەنێو میللەتی کورددا پێگەیشتوون‌و هەڵکەوتوون، کە بێگومان مەلای گەورە (مامۆستا مەلا موحەممەدی کۆیی جەلیزادە) یەکێکیانە، کە بە ڕای من مامۆستای گەورە لە سەردەمو ڕۆژگاری خۆیدا، جگە لە مامۆستا (بديع الزمان/ سەعیدی نوورسی) ڕەحمەتی

خوای لێبێ هاوتای نەبوون، یاخود بەدەگمەن، یاخود ڕەنگە ئێمە ناوو ناوبانگیمان پێنەگەیشتبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زانا ناودارو پایەبەرزە، نەك هەر مافی خۆی پێنەدراوە لە ڕووی ناساندنیو چاپو بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیو بەهرە لێوەرگرتنیانەوە، بەڵکە زۆریش پشتگوێ خراوەو کەمتەرخەمیی لە بەرانبەردا کراوە.

جا ئەوەی پاڵی بە منەوە نا، کە ئەم کۆڕە لە بارەی مەلای گەورەوە ببەستم، چەند شتێك بوو:

یەکەم: پاش خوێندنەوەی تەفسیرەکەی مەلای گەورە لە بەرگەوە بۆ بەرگ و بە وردیی، بۆم دەرکەوت کە بە ڕاستی ئەو تەفسیرە گەنجینەیەکی پڕ لە گەوهەرو مرواریییەو، حەیفە ئاماژە بە بەشێك لە گەوهەرو مرواریییەکانی ئەو خەزێنەیە نەکرێ!

دووەم: ڕاستکردنەوەی گەلێك بیروبۆچوونی هەڵەو دوور لە ڕاستی لەبارەی ئەو کەڵە زانایەوە، کە بەداخەوە نەك هەر خەڵکی عەوامو سادە، بگرە زۆرێك لە نووسەرو ڕۆشنبیرانیشمان گێرۆدەیان بوونە، کە من بە پێویستم زانی لە دوو توێی ئەم بابەتەمدا ئەو بیروبۆچوونە هەڵانە بخەمە ڕوو!

سێیەم: وەك جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانم بەرانبەر بەو کەسایەتییو زاناو پێشەوا بێنازەی کورد، کە لە ڕاستیدا بێناز بووە، چونکە بەرهەمێکی زۆر بەسوودو گەورەی پێشکەش کردوە بە نەتەوەکەی خۆیو بە زمانی خۆی، کە (١٠) ساڵی ڕەبەقی خایاندوە، بەڵام (٦٦) ساڵ دوای کۆچی دوایی خۆی بە چاپ گەیەنراوە!

هەر لە سەرەتاشەوە دەڵێم:

بابەتی کۆڕەکەی من چەند سەرنجێکە لەبارەی تەفسیرەکەی مامۆستای گەورەی کۆیە، نەك قسەکردن لەبارەی کەسایەتیی‌و بیروبۆچوونەکانی‌و هەموو لایەن‌و ڕەهەندەکانی ژیانییەوە بەگشتی، هەرچەندە مامۆستای گەورە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- لە دوو تویێی تەفسیرەکەیدا سەرجەم، یان لانیکەم زۆربەی بیروبۆچوونەکانیشی خستوونە ڕوو.

دیارە بێگومانیش ناگونجێ لە وتارێکدا بەتەواوی قسە لەسەر کەسایەتیی مامۆستای گەورەو بە تایبەت تەفسیرێکی (١٠) بەرگی بکرێ‌و هەڵبسەنگێنرێ، بەڵام وەك گوتراوە: ئەوەی ئینسان فریای هەمووشی ناکەوێ، نابێ واز لە هەمووشی بێنێ (مالا يُدرَكُ كُلُّهُ لا يُترَكُ جُلُّهُ). لەسەر ئەم بنچینەیە من ئەم بابەتەی خۆمتان پێشکەش دەکەم، هەوڵیش دەدەم گرنگترین شت -بەلای منەوە- کە پێویست بێ لەبارەی تەفسیرەکەی مەلای گەورەوە بزانرێ، بیلێم.

شایانی باسیشە من لە چوار تەوەرەی سەرەکیدا باسی تەفسیرەکەی مەلای گەورە دەکەم:

# تەوەرەی یەکـەم

# مـەلای گـەورەو تەفسیرەکەی

## یـەك: مەلای گەورە:

ناوی تەواوی: (محمد کوڕی عبدالله کوڕی اسعد کـوڕی عبـدالرحمن کوڕی عبدالله...) لە بنەڕەتدا خـەڵکی گونـدی (بێگـەڵاس)ی پـشدەرن،ساڵی (١٨٧٦ ز) لە دایك بـووەو لـە (١٩٤٣) لـە تەمـەنی (٦٨) سـاڵیدا لـە کۆیە کۆچی دوایی کردوە، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا بە ڕای من لـە ڕۆژگاری خۆیدا لەنێو گەلی کورددا مامۆستا مـەلا سـەعیدی نوورسـی (بـدیع الزمـان)ی لـێ دەرچـێ، زانـاو شـارەزای وەك مـەلای گـەورەی کۆیە، یان نەبوون، یان زۆر دەگمەن بوون.

مەلای گەورە زانایەکی بیرفووڵو گشتگیر بووە، چ لە بواری زانستە ئیسلامییەکانداو، چ لە بواری زانستەکانی سەردەمو تەوژمە سیاسـیو فیکرییـەکانی ڕۆژگـاری خۆیـدا، بەڕاسـتی پیـاوێکی زۆر چـاوکراوەو بلیمەتو شارەزا بووە، وەك لە تەفسیرەکەیدا دیـارە، هەڵبەتـە مـەلای گەورە تەنیا خاوەنی تەفسیرەکەی نیە، وەك لە برگـەی دووەمـی ئـەم تەوەرەیەدا باسی دەکەین، بەڵکو وێڕای تەفسیرەکەی کۆمەڵێك کتێبی دیکەشـی لـە زۆربـەی لقـەکانی زانـستی ئیـسلامییدا نووسـیون، بـەڵام بەداخەوە ژمارەیەکی کەمیان نەبێ بە چاپ نەگەیەندراون.

ئینجا وێڕای زانیاریو شارەزایی فراوان، مەلای گەورەی کۆیە خاوەنی عەقڵێکی ئازادو کراوەو جورئەتێکی کەم وێنەش بووە، لە گوتنی بیروڕاو قەناعەتەکانی خۆیداو وەك لە قسەو هەڵوێستەکانیشیدا دیارە، مامۆستای گەورە پیاوێکی دیندارو ڕەوشت بەرزو بە عیززەتو، لە هەمان کاتدا سەخاوەتمەندو قسەخۆشو خاوەن صەبرو تەحەممول بووە!

وە بە پێچەوانەی ئەوەوە، کە لەلایەن هەندێك نووسەرو ڕۆشنبیرەوە وێنا کراوە، هەرچەندە مەلای گەورە پیاوێکی زۆر نیشتیمانپەروەرو بۆ نەتەوەکەی دڵسۆزو بە پەرۆش بووە، زۆریش دژی ئەفسانەو شتی پڕوپووچ بووە،کە بەناوی ئیسلامەتیو بەتایبەت لە ڕێگەی تەریقەتو تەصەووفەوە کاتی خۆی هاتۆتە نێو میللەتو ڕەواجی پێدراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەلای گەورە زۆر دوور بووە لە دەمارگیریی نەتەوەیی (التعصّب القوميّ)، زۆر دوور بووە لە لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانەی ڕۆژئاواو ئەورووپاو پەنابردنە بەر عەلمانییەت!! وەك بە داخەوە هەندێك خەڵك، کە شتیان لەسەر نووسیوە وایان وێنا کردوە، کە گوایە مەلای گەورە وەك بڵێی ڕچەشکێنێکی عەلمانییەتو ڕووکردنە ڕۆژئاوا بووە، لەنێو نەتەوەکەیدا.

بەڵێ مامۆستای گەورە وەك گوتم، زۆر دڵسۆزی گەلو نیشتیمانەکەی خۆی بووە، پیاوێکی زۆریش ڕەخنەگر بووە لەو واقیعەی، کە تێیدا ژیاوە، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر دەستگرتوو بووە بە ئایینو ڕێبازی خواوەو هەوڵیداوە گەلو نەتەوەکەی بەهۆی پیادەکردنی شەریعەتەوە کێشەو گرفتە

نەتەوەیی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی چارەسەر بکات، وەك هەموو زاناو پێشەوایەکی ڕەسەن و ڕاستەقینەی دیکە، لە یەکێك لە شیعرەکانیدا کە هەڵقوڵاوی دەروونێکی پڕ لە تاسەو پەرۆشە، گوتوویەتی:

چ بکەم چ بڵێم لە تاوی کوردان
ئاگر دەگرێ دڵم لە دەردان
چارە چیە! خودایە تۆ دەزانی
خۆت عالمی زاهیر و پنهانی
ئەم زوڵمە قبووڵ نەکەی خودایە
ئەسڵا ئەمەلم بەکەس نەمایە
لوتفی تووە مەلجەئو پەناهم
ڕوحمێکی بە کورد بکەی ئیلاهم!

هەڵبەتە وەك لە سەرەتاوە ئاماژەم پێدا، من نامەوێ بە درێژیی باسی کەسایەتیی مامۆستای گەورە بکەم، چونکە بێگومان لێرەدا دەرفەتی ئەوەم نیە.

## دوو: تەفسیری مەلای گەورە

بەرلەوەی بچمە سەر باسی تەفسیرەکەی مەلای گەورە، بە پێویستی دەزانم سوپاس و دەستخۆشی ئاراستەی هەموو ئەوانە بکەم، کە بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕۆڵیان گێڕاوە لە خزمەتکردن و هێشتنەوەو چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و بەرهەمەکانی مامۆستای گەورەی کۆییدا، هەم تەفسیرەکەی، هەم کتێب و نووسراوەکانی

دیکەی، جا چ ئەوانەی خۆیان بە قوتابیو فەقێی مامۆستا زانیوە، چ هەندێك لە خزمو نزیکانی، بەتایبەت مامۆستا مەلا عبدالقادری کانی دەربەندیو مامۆستا مەلا معصومی هەورامی، لە خزمانو بنەماڵەکەشی بەتایبەت (نەجیبە خان)ی کچی مامۆستا -خوا لێی خۆشبێ- کە بە پێی قسەی کاك (د.جەواد) کوڕی مامۆستا مەلا حمدامین چۆم حەیدەری، ئەو خوشکە بەڕێزە ڕۆڵی سەرەکی گێڕاوە لە پاراستنی بەرهەمەکانی مامۆستای بابیدا.

هەروەها سوپاسو دەستخۆشییەکی تایبەتیش ئاراستەی برای بەڕێزم (د.جواد مەلا حمدامین چۆم حەیدەریی) دەکەم، کە نامەی ماجستێرەکەی بە ناوونیشانی: ((محمد بن عبدالله الجليّ (مەلای گەورە)و جهوده العلمية)) بووەو لێکۆڵینەوەیەکی وردو بابەتییانەیە لەبارەی کەسایەتیو بەرهەمەکانی مەلای گەورەی کۆییەوە، خوا پاداشتی بداتەوەو وێنەی زیاد بکات.

دەربارەی پێناسەی تەفسیرەکەی مەلای گەورەشەوە دەڵێم:

١- ناوونیشانی تەفسیرەکەی بەم شێوەیە: ﴿تەفسیری کوردیی لە کەلامی خوداوەندیی﴾ کە لە ساڵانی (١٩٣٣-١٩٤٣) واتە بە دە (١٠) ساڵی ڕەبەق لە گەرمەی جەنگی جیهانیی دووەمدا تەواوی کردوە.

٢- ئەو تەفسیرە لە ساڵی (٢٠٠٩)دا بۆ یەکەم جار چاپ کراوە، واتە: (٦٦) ساڵ پاش نووسرانی! هەڵبەتە لەسەر ئەرکی جەنابی مام جەلال سەرۆك کۆماری عیراقی فیدراڵ چاپ کراوە، بۆیە پێویستە سوپاسی بکەین، هەروەها سوپاسی ئەو لیژنەیەش دەکەین، کە سەرپەرشتی ئامادەکردنو چاپکردنی کردوە، هەرچەندە بەداخەوە -وەك من لە (أ)وە تا (ی) هەموویم

خوێندۆتەوە -(تایپو دیزاینو کاغەزو بەرگ)ی تەفسیرەکە لە قەدەر تەفسیرەکە نیەو کەموکووڕی زۆری تێدایەو بەڕاستی ناڕێکە، ئەوەش کاریگەریی سەلبیی هەیە لەسەر باش نەخوێنرانەوەو بەهرە لێوەرنەگیرانی، کە هیوادارم بەزوویی چاپێکی شایستە بکرێتەوەو کەمو کووڕییەکانیشی چاك بکرێن، من ئامادەم نوسخەکەی خۆم بدەمە دەست ئەوانەی، کە بەو کارە هەڵدەستن، چونکە هەڵەی چاپی زۆرم ڕاست کردوونەوەو هەندێك تێبینیو سەرنجی باشیشم لەسەر نووسیون، کە پێم وایە تەفسیرەکە دەوڵەمەندتر دەکەن[١].

٣- مەلای گەورە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- وێرای کتێبو سەرچاوەی زۆری دیکە، بۆ نووسینی تەفسیرەکەی سوودی لەم تەفسیرانە بینیوە، هەڵبەتە وەك دواتریش ئاماژەی پێدەکەین، کە مامۆستای گەورە زیاتر پشتی بە تێگەیشتنی خۆی بەستوە بۆ قورئان، بەڵام دیارە وەك لە تەفسیرەکەیدا ئاماژەیان پێدەکات، بەهرەی لەم سەرچاوانەش وەرگرتوە: ﴿الطبري، الرازي، الزمخشري، البيضاوي، النيسابوري، أبو السعود، الآلوسي، محمد عبده، رشيد رضا، الطنطاوي﴾.

٤- ئامانجی سەرەکی مەلای گەورە لە نووسینی تەفسیرەکەی وەك خۆی گوتوویەتی: ﴿ذاتاً من لە تەفسیر مقصدم (بعض)ە معانی خۆمو (وجە)ی نظم وإرتباطي آیاتو سورەتە، خوا بۆ إکمالی موفقمان بکات). ب٧، ص٢٦٧.

---

١) لەم ڕۆژەدا لەسەر داوای خۆی، نوسخەکەی خۆمم بۆ برای بەڕێزم دکتۆر جەواد نارد، بۆ چاپی دووەمی تەفسیرەکە سوودی لێوەربگرن.

هەڵبەتــە ئەوکاتــە شــێوازی نووســین بــە تایبــەتی هــی مامۆستایان‌و زانایانی ئیسلام بەو شێوەیە بووە، ڕوونـی دەکاتـەوە کە مەبەستی لە دانانی تەفسیرەکەی زیاتر ئەو بیروبۆچوونانەی خۆی بـووە، لەگـەڵ جـۆری تێگەیـشتنی خـۆی لـە ئایەتـەکان‌و چۆنیەتی پێکەوە پەیوەستبوونی ئایەت‌و سوورەتەکان.

٥- سـەرەتای دەسـتپێکردنی تەفـسیرەکەی، دیـارە مامۆسـتای گـەورە بۆخـۆی ڕوونـی کردۆتـەوە، کـە چـەند گـەنجێکی شـاری (کۆیـە) دەچنە خزمەتی‌و بۆی پێشنیار دەکەن، کە تەفسیرێکی قورئـان بنووسێ، کە ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ ئینـسان هەرچـەندە زانـاو شـارەزا بـێ، پێویـستی بـە هاوکـاریی‌و هانـدان‌و پێـشنیارو داوا لێکردنی خەڵکی دی هەر هەیە، ڕەنگە ئەگەر ئەو کۆمەڵە گەنجە کۆییـە نەچووبانە خزمـەت مامۆسـتاو بۆیـان پێشنیار نـەکردبا، ئێستا ئەو تەفسیرە نەنووسـرابایە، ئـەوە لـە ڕووی ڕواڵەتییـەوە، لە ڕووی مەعنەویشەوە مامۆستا بۆخۆی لە کۆتایی تەفسیرەکەیدا ئامـاژە بـە خـەونێك دەکـات، کـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی هانـدان بـێ لەسەر دەستپێکردنی تەفسیرەکەی، وەك لەوبارەوە دەڵێ:

﴿پێش إقدام کردن لەسەر تەفسیر، شـەوێ لـە خـەوما سـێ زات یەکێ: جەنابی کبریائی، -کە مەبەستی خوای پـەروەردگارە- یـەکێ (حـضرة)ی پنـاهی، -مەبەسـتی پێغەمبـەرە ﷺ- یـەکێ بـاپیرە گەورەم (مـلا عبـدالله إبـن الجلیّ) لـە گۆشـەی (جهـە)ی (غـرب)ی حەوشەی ماڵێ ڕاوەستا بوون، منیش لەو خـەوە لـە هۆدەی خـۆم لەسەر پشت درێژبووبووم، تەماشای کتێبم ئەکرد، لە پەنجـەرەوە ئـەو (ذوات)انـەم هاتـە بـەر (نظـر)، لـە خۆشـیان وتم: ئۆخـەی

ئەوجار هەر (إشكال)ێ لە قورئان، یان لە (حدیث)م بوو، ڕاساً مراجعەی خواو پێغەمبەر ئەكەم، هەڵستام بۆ خزمەتیان بچم، لەگەڵ هەستان لە خەو هەستامو بەخەبەر هاتم، ئاملم زۆر بوو بۆ زانینی قورئانو حدیث﴾ ب١، ص٧٢٦.

٦- هەندێك تایبەتمەندیی تەفسیرەكەی مەلای گەورە:

١/ زۆر هەوڵیداوە، كە ئایەتەكان پێكەوە پەیوەست بكات، بەبێ پەنا بردنە بەر هۆیەكانی هاتنە خوار (أسباب النزول)، -كە جاری وا هەیە بە بۆچوونی من لەوەدا زێدەڕۆیی كردوە!- هەروەها هەوڵیداوە سوورەتەكانیش پێكەوە پەیوەست بكات.

٢/ تەفسیرەكەی وێڕای ڕاڤەكردنی ئایەتەكان، ئاوێنەیەكی باشی واقیعی سیاسیو فیكرییو كۆمەڵایەتیو...هتدی ئەو ساتەی كوردستانو عیراقو جیهانی ئیسلامیشە بەگشتی، بگرە زۆرجار باسی ڕووداوو گۆڕانكارییەكانی وڵاتانو دونیاش دەكات لە میانەی تەفسیركردنەكەیدا.

٣/ بۆ لێكدانەوەی ئایەتەكان زۆر پشتی بە عەقڵ بەستوەو بەدەگمەن پەنای بۆ فەرموودەو شوێنەوارەكان بردوە، -وە بە بۆچوونی من- هەست ناكرێ لە لێكدانەوەی ئایەتەكاندا تەقلیدی كەسی كردبێ، بەڵكو گەلێك جار ڕایەك هەڵدەبژێرێ، كەكەس پێشتر نەیگوتوە، یان ئەگەر گوترابێش، ڕەنگە ئەو پێی نەزانیبێ، واتە بەبۆچوونو ئیجتیهادی خۆی بووە، كە بێگومان قورئانیش بە درێژایی زەمان، بۆچوونو تێگەیشتنی جیاجیا هەڵدەگرێ.

٤/ زۆر گرنگی داوە بە بەستنەوەی قورئانو ڕێنمایيو یاساکانی بە واقیعی ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگاکەیەوەو، بە چارەسەری گیروگرفتو کێشەو نەخۆشییەکانی.

٥/ شارەزاییەکی باشی هەبووە لە واقیعی سیاسیو فیکریيو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکەی، هەروەها ئاشنایی باشی بە تەوژمە فیکرییو سیاسییەکانی ئەوساکەی وڵاتانی ئیسلامییو دونیاش هەبووە.

٦/ زۆر ئاگاداری مێژووی موسڵمانان بووە، بەڵکو شارەزایی بە مێژووی جوولەکەو نەصرانییەکانو کتێبەکانیشیان هەبووە.

٧/ ئەو واقیعەو ئەو هەلومەرجە خودییو بابەتیی (ذاتيو موضوعي)یەی، کە مەلای گەورە تەفسیرەکەی تێدا نووسیوە زۆر سەختو دژوار بووە، چونکە لە لایەکەوە ئەوکاتە عیراقو کوردستانو جیهانی ئیسلامیش بەگشتی، لە حاڵەتێکی زۆر ئاڵۆزو گرژو پڕ مەینەت دابووە، هەم بەهۆی تازە کۆتایی پێهێنرانی خیلافەتی عوسمانیی لە ساڵی (١٩٢٤ز) بە ڕەسمییو، هەم بەهۆی هاتنە پێشی سەرەتاو پێشەکییەکانی جەنگی جیهانیی دووەمەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە مەلای گەورە دیارە هەر لە زووەوە گرفتاری کۆمەڵێك نەخۆشییو ئازار بووە، وەك خۆی لە چەند قسەیەکدا دەریبڕیوە، کە تەعبیر لەو واقیعە سەختە خودییە دەکەن، کە مەلای گەورە بە ڕەحمەت بۆ تێیدا ژیاوە، ئەوەش لەکاتی تەفسیرکردنی ئایەتی: ﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ

أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ الأنبياء﴾، دا -کە دەڵێ-: ﴿نێزیکە بڵێم: من لە (أیوب) نەساغ ترم، حاڵم ناخۆشترە، بە باداریی، بە مایەسیریی مُبتلام لە أولی عمرەوە، فقد نعوذ بالله قصم الفقر ظهري، مُلْك لێ غَصْب کرای، ماڵ بە تالان چووی، کەسێ مطلعي حاڵم بێ، تعجّب ئەکا چۆن شتێ ئەزانم، چۆن ئەتوانم بنووسم! علاوەی هەمووی: آل چاغی (أحمد دەیونی) حزناً علی حزن ئەدا﴾ ب٦، ص١٥١.

دیارە (أحمد دەیوونی) قائمقامی ئەوکاتەی کۆیە بووە، (آل چاغ) وا پێدەچێ وشەیەکی تورکی بێ، دیارە ئەو کابرایە لەگەڵ مامۆستای گەورە زۆر بەدفەڕ بووەو زوڵمی لێکردوە، واتە هەم لە ڕووی جەستەییو هەم لە ڕووی داراییەوە، جەنابی مامۆستا وەزعێکی ناڕەحەتی هەبووە، کە لە زۆر شوێنی تەفسیرەکەی ئاماژە بەو شتانە دەکات، بەڵام پیاوێکی زۆر خاوەن (عزّة النفس) بووە، بەڵێ لە تەفسیرەکەیدا گەلێك جار ئەو موعاناتو دەردەسەریی و ناڕەحەتییانەی خۆی باسکردوەو نووسیوە، بەڵام وا پێناچێ بۆ هیچ کەسی ئاشکرا کردبێ!

## تەوەری دووەم:

# ئەو خاڵە گرنگانەی، کە مەلای گەورە لە تەفسیرەکەیدا جەختی لەسەر کردوونەوە

دیارە ئەم تەوەرەیە زیاتر ئامانجی سەرەکی بابەتەکەی منە، هەڵبەتە وەك لە سەرەتاشەوە باسم کردو ئاگربڕی خۆمم کرد، زۆر زەحمەتە سەرجەم ئەو باسو بابەتە گرنگانە بخرێنە ڕوو، کە مەلای گەورە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- لە تەفسیرەکەیدا داکۆکی لەسەر کردوون، بەڵام من بەگوشراوی‌و بە ئاماژە کردن‌و بە بەلگەهێنانەوەی قسەکانی خۆی، ئەم (١٥) خاڵانەم هەڵبژاردون‌و بە گرنگتر هاتوونە بەرچاوم:

**یەکەم: خوا بە یەکگرتن (التوحید)و دژی شیرك‌و بیدعەت‌و ئەفسانە بوون:**

دەتوانم بڵێم: ئەم بابەتەی داکۆکیی کردن لە خوا بە یەکگرتن و تەنیا خواپەرستن، وە دژایەتیکردنی شیرك‌و بیدعەت‌و ئەفسانە، تەوەرەو سورگەی سەرەکی تەفسیرەکەی مامۆستای گەورەیە -ڕەحمەتی خوای لێبێ-، وە زۆرترین بایەخی پێدراوەو باشترین پانتایی بۆ تەرخان کراوە، کە بێگومان قورئانیش بۆ خۆی هەر وایەو بەزۆری هەر لەو چوارچێوەو خولگەیەدا دەخولێتەوە،جا مەلای

گەورەش لە کاتی تەفسیری هەر بابەتێکدا،کە باسی خوا بە یەکگرتن (التوحید) دەکات قسەی لەسەر دێنێو ئاماژەش بە واقیعی کوردەواری ئەوساش دەکات، بۆ وێنە لەوبارەوە باسەرنجی چەند قسەیەکی مامۆستا بدەین:

* لە تەفسیری ئەم ئایەتە: ﴿... فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ الأنبياء﴾، واتە: پاکیی بۆ خوای پەروەردگاری عەرش، لەوەی کە ئەوان وەسفی دەکەن، دەڵێ: (سبحان الله صوفیە لەگەڵ ئەو بورهانی عقلیو قورئانی، دەرحەق بعضێ ذواتي موهومي خۆیان ئەڵێن: (لَوْ خَلَتْ لَقُلِبَتْ)[1]، دەك نغرۆ بێ، ئەگەر دوام و نظامي یەکی لەسەر غەیری خوا کەوتبێ! إلاهی ئەوە چ بوو؟ بەناوی ولایة ئەو شرکە ظاهرە کوو کەوتە ناو عالەمی إسلامی؟!) ب٦، ص١٢٣.

دیارە مەبەستی مامۆستای گەورە هەندێك لە ئەهلی تەصەووفە ئەوانەی، کە زێدەڕۆییان تێدا کردوە، ئەگەرنا تەصەووفی پابەند بە قورئانو سوننەتو شەریعەتەوە، دوورە لەو تێپەڕاندنو بەزایەدان (إفراط و تفریط)ە.

* هەروەها لە تەفسیری ئایەتی: ﴿...لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ الأنبياء﴾، واتە: بێجگە لە من هیچ پەرستراو نین، تەنیا بەندایەتی بۆ من بکەن، دەڵێ: (تەنها عبادەتی خوا بکەن

---

١) یانی: ئەگەر جیهان ئەو کەسە یان کەسانەی تێدا نەمێنن ژێرەو ژوور دەبێو تێکدەچێ!!

عبادەتی غیری ئەو مەکەن، ئەمما ئەوە ئەگۆڕن! تەماشا ئەکەی لەبەر دەستی ذاتیٚ ڕائەوەستیٚ خضع الرّقاب نواكس الأبصار مُذَمیی دوایی ئەگەڕێتەوە پاشەوپاش تا بزر ئەبیٚ ئەڵێن: ئەمە عبادەت نیە! خلاصە کەسیٚ تەماشای أحوالی مِلَل بکا جزم دێنیٚ ئەو شرکی الوهیة و ربوبیتی لە نێو ملیۆنان دا هەیە، لە زەمانی جاهلیت نەبووە! ب٦، ص١٢٦.

(مِلیۆن) واتە: خاوەن دینەکان لە مسوڵمانو جوولەکەو نەصرانیی‌و...هتد، دیارە بێگومان ئێستاش ئەو جۆرە حاڵەتانە هەر هەن لەنێو هەندێك لە ئەهلی تەصەووف دەرچوو لە شیرازەی شەریعەت، کە بە شێوەیەك مامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵ هەندێك لە شێخو برا گەورەکانیان دەکەن، کە دەبیٚ ئەو مامەڵەیە لەگەڵ خوادا بکریٚ! وەك چۆن خوا دەفەرمویٚ:
﴿ ...وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ البقرة ﴾.

واتە: بۆ خوا بە ملکەچیی ڕاوەستن، بەڵام هەندێك لەوان ئەو شێوە ڕاوەستانەی کە دەبیٚ بۆ خوا بیٚ، بۆ غەیری خوای دەکەن، دیارە مامۆستای گەورە ڕەخنە لەوە دەگریٚ، هەڵبەتە لەوبارەوە زۆر شتی دیکە باس دەکات.

## دووەم: پابەندیی بە قورئانەوە:

بۆ وێنە:

* لە تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە خوای پەروەردگار لە سەرەتایانەوە دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ

(١) الكهـف ﴿، هەنـدێ قـسەی زۆر نەسـتەق دەکـات دەربـارەی شوێنکەوتنی قورئان، دەڵێ: (قورئـانی کـریم نعمـەتێ فـوق الـنعم، هـادي الأمـم، مایـەی سعادتی حیـاتی دنیـاو آخـرة، منبعـی أصولی إعتقادات وأحكام، عبـادات و معـاملات و سیاسـەتی پـاك و مدنیـەتێ فاضلة، کتابی ئیلاهی، رسولی ئیلاهـی، ئـەبێ بـێ مـەیل و موحابا بـێ، ڕاسـت و ڕەوان، بـێ خوارەکـەو پێـچەکەی تعـصّبی قـومی و إمتیازی أقارب و تەرجیحی قوم و خۆیش بێ...باسی وحـی ئیلاهـی بۆ نحل ئەکات،-واتە قورئان باسی ئەوە دەکـات، کـە چۆن وەحیـی بۆ هەنگ ناردوە- کەلامی ژنێ سوورەتەو -مەبەستی پـێ قـسەکەی مەلیکەی (سبأ)ەو ئیشارەتی مێرووێ، کە فائیدەی تیابێ بەوەحی ئەنێری بۆ ڕەسولی خۆی، کەوابێ: ئەو کتابە في نفسه كامله...

حقـاً قورئـان کتابـێ زۆر خاوێنـە، دوورە لـە خرافـات و أمـوری تافهەو غیر معقولە، لە تورات ئەڵێ: وێنە دێنێتەوە، سەرنجی ئـەو قـسەیەی تـەورات بـدەو بـەراوردی بکـە لەگـەڵ قورئـان، ئینجـا گەورەیی قورئانت بـۆ دەردەکـەوێ: خـوا ئـەمری کـردە مووسـا بـە بەنی ئیسرائیل بڵێ: هەر صاحب ماڵێ ئەگەر ممکن نەبوو بە دوو مـاڵان حیوانـێ بکوژنـەوە، بەردەرکـەی خۆیـان بـە خوێنـێ پـێ پرشێنن، ئـەمن شـەوێ دێم ضـربة لـە میـسریان دەدەم، ئـەولادی بکریـان دەکـوژم چ هـی ئینـسان چ هـی حیـوان -واتـە منـداڵی نۆبەرەیان - تا ئەو دەرکەی بە خوێن ڕشـابێ بـزانم هـی ئێوەیـەو نەیچمە نێو بە خانووی میسریانم لـێ نەگۆڕێ!

جا بزانە قسەیە چەند چرووکە! ئەمڕۆکە ئـەو کتابـە بـەناوی کتابی مقدّس ترجمه وإعلان ئەکـەن، بـزانن قورئـان نیعمەتـە بـۆ

سائیری رسل، کە لەو نەوعە تەبریەیان ئەکا، ئەفەرموێ: کتابیان تحریف کراین. ب ٥، ص (٢٥٢،٢٥٣).

* هەر لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبًا ... ﴿٢٣﴾ الزمر﴾، واتە: خوا باشترین فەرموودەی ناردۆتە خوار، دەڵێ: (محقق بزانە بۆ حیاتی روحی، نزولی قورآن گەلێ لە باران بۆ حیاتی مادی نافع ترە، ئەگەر بکەوێتە ناو دڵت، ئەیکا بە ینبوعی حیکمت لەوێڕا بۆ أطرافي بدن أنهارو جداولی دێ -واتە ڕووبارو جۆگەلەکان- أنواعی مختلفە لە علوم لە فضائل و شرفو ناموسو غیرةو رەمیلی کریمانەو رحیمانە لە نفسو هیکلی إنسان شین ئەکا، ثمري بۆ أنام، دەرئەخا. ب٨، ص٢٢٦.

هەڵبەتە وتەکانی مامۆستای گەورە زۆربەی وشەو (مفردە)کانی عەرەبین، بەڵام پێموایە کە لە سیاقی قسەکان لێی تێدەگەن، بۆیە پێویست ناکات تەرجەمەی بکەمەوە.

* هەر دەربارەی پابەندیی بە قورئانەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ ...﴿١٨٠﴾ البقرة﴾، دەڵێ: (لای من وایە ئەوەی بینی دوو بەرگی مصحف نووسراوەتەوە، هیچ منسوخ نیە، بەڵێ بەعضی أحکام بە طبیعەتی حاڵ ڕائەوەستێ، بەڵام الی الأبد بێ حکم نامێنێ، بۆیێ حضرەتی رسولو یارانی گوزینی -واتە هاوەڵانی هەڵبژاردەی- ئەو ئایەتانەیان هێشتۆتەوە تاوەکو ڕۆژی خۆی بۆ ئۆممەت بەکاربێ. ب١، ص٢٠٣.

دیارە من بۆ خۆشم قەناعەتم هەر وایە، هەڵبەتە یەکەم کەس لە توێـژەرەوانی قورئـان کـە گوتوویـەتی: قورئـان هـیچ ئایـەتێکی تێـدا نیـە، کـە مەنـسووخ بـێ‌و کـاری پێنـەکرێ، (أبـو مـسلم الأصفهاني) بووە، هەڵبەتە مەنـسووخ بـەو مەفهوومـەی کـە ئێـستا بـاوە! مامۆسـتای کۆیـەش هـەمان قەناعـەتی هـەبووە، وە زانایـانی پێشین کە وشـەی (نـسخ)یـان بـەکارهێناوە، هەنـدێکیان بـە مانـای حوکمێك کە گشتی (عام)ەو تایبـەت (تخصیص) کـراوە، یـان ڕەهـا (مطلق)یەو بەنددار (مقیّد) کراوە، بەو مانایە بەکاریانهێناوە.

* هـەر دەربـارەی قورئـان مامۆسـتای گـەورە دەڵـێ: (گەلـێ جـار وتوومە: ئەبا علمای کرام دوو فقـە تـدوین بکـەن خاصـە أحکامي سیاسـیەو إدارە، یـەکێ بـۆ زەمـانی عیـززەت، یـەکێ بـۆ زەمـانی زیلت!..) ب١، ص٦٨٤.

هەر دەربـارەی (نـسخ) دەڵێ: خـوا -سبحانە و تعالی- بـۆ وێنـە: لـە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦﴾ الکـافرون کاتێـك، کـە تۆ بێ دەستەڵاتی -دیارە لەگەرمەی جەنگی جیهانیی دووەمدا ئەوەی گوتـوە-، جگـە لـەم حوکمـە: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦﴾ الکـافرون، بەرانبـەر بـە کـافران چـی دیکـەت لەدەسـت دێ؟! ئایـا دەتـوانی ﴿...وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً ... ۝٣٦﴾ التوبـة، جێبـەجێ بکەی؟، جا دەڵێ: ئەمەیان نەسخ نەبۆتەوە، بەڵام جارێ حوکمەکەی ڕادەوەستێ، تا ئوممەت دەستەڵاتی پەیدا دەبێتـەوە، ئەوکاتـە کـاری پێدەکرێ!

## سێیەم: جەختکردنەوە لەسەر زانستو هۆشیاریی:

* لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّقَوۡمٍ يَعۡقِلُونَ ﴿٤﴾ الرعد﴾، واتە: لەمەدا چەند نیشانە هەن بۆ کەسانێك، کە عەقڵیان هەبێ، دەڵێ: (ئەوی بۆ ئێمە لازم بێ بەکەڵکمان بشێ: خوایە، شەریعەتە، طبیعەتە، بە إیمان بە وحدانیەتی خوا لە ئەسارەتی مطلق نجاتمان ئەبێ، بە إتباعی شەریعەتی خالصە مطهرة نظامي حیاتمان چاك ئەبێ، بە إستخدامی طبیعەت نفعی زۆر لە مخلوقاتی خوا ئەبینین، أسرار دەرئەخەین، إختراع زۆر ئەکەین، بە سیارەو طیارة ئەچین بۆ حەج بۆ زیارەتی رسولی کبریاء لەکۆڵ حندرحۆی حوشتر ئەبینەوە، حاصلی بە علمو عمل ترقی ئەکەین، ئەگەر بێناموسیی ئەوروپایی لێمانگەڕێ، بەشەرەف ئەژین، بەشەرەف ئەمرین، بەشەرەف زیندی ئەبینەوە والسلام. ب٥، ص (٥٠، ٥١).

دیارە زانیویەتی ئەورووپاییو ئەوانەش کە بەدوایان دەکەون، زۆر بێناموسیی بڵاودەکەنەوەو ڕەواجی زۆری پێدەدەن!

* هەر لەسەر زانستو هۆشیاری لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿... كَمۡ أَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ الشعراء﴾، واتە: چەند ڕووەکی بەپێزو بەبەرهەممان لە زەویدا شین کردوە، دەڵێ: (...حقا ئێمە ممنونی ئەو بحاثانەین -ئەو لێکۆڵەرەوانە- کە تعقیبی أحوالی ئەو کائناتە ئەکەن أسرارمان بۆ دەرئەخەن، ئێمە لەبەر ترکیباتی نحوی ئاگامان لە ترکیباتی گونی نیە. ب٦، ص٣٠.

ڕاست دەکات زۆر جار مامۆستایان، مەلاکانی خۆمان کاتی خۆی زیاتر هەر خەریکی تەرکیباتی زانستی (نحو) واتە تەرکیب‌و ئیعرابی ڕستەکان بوون‌و، کەمتر ئاگایان لە تەرکیباتی بوونەوەرو کەون‌و کائیناتی خوا بووە، دیارە مامۆستای گەورە هەر بەو بۆنەیەوە دەڵێ:

**عیلمی طبیعەت عیلمی خودایە ... قال‌و قولە گشتی هەبایە!**

هەڵبەتە مەبەستی ئەوەیە کە زێدەڕۆیی نەکرێ لە زانستەکانی (نحو، صرف)دا، ئەگەرنا بێگومان ئەگەر خۆشی زمانی عەرەبی‌و هەموو ئەو زانستانەی دیکەی باش نەزانیبایە، نەیدەتوانی تەفسیری قورئان بنووسێ.

## چوارەم: وەحدەت‌و یەکڕیزیی:

مەلای گەورە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- زۆر باسی وەحدەت‌و یەکڕیزیی موسڵمانان دەکات، بەهەمان شێوە زۆریش باسی برایەتی‌و یەکڕیزیی نەتەوەی کورد دەکات:

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخۡتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ ...﴿١٠٥﴾ آل عمران ﴾، دەڵێ: (یەك فکرو یەك دڵ‌و یەك زبان‌و یەك غایە بن، وەك جووو دیانان مەبن، بە درۆی: (إختلاف أمتي رحمة) — واتە: ڕاجیایی ئوممەتم ڕەحمەتە، دیارە شتێکی وا بە ناوی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگوترێ، کە بێگومان فەرموودەی ئەو نیەو لەڕووی (سند)ەوە (صحیح) نیە، واتە بەوە هەڵمەخەڵەتێن – هەڵمەخەڵەتێن، مەڵێن ئەوە قسەی رسولی

خودایە، ئەبێ هەر بێتەجێ! ذاتاً ئەو نوعە مفسدانە بوون لێیان تێکداین، هەر ئایەتێ ڕووحێکی إجتماعی تێدابوو بە حدیثی درۆ هەڵبەستی خۆیان ڕووحەکەیان برد... - ڕاستە زۆرجار فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو، کە قورئانی پێ تەفسیر دەکرێ ماناکەی دەکوژێ- ئێمە دیمان‌و ئەبینین عالەمی ئیسلامی لە چ عظمة و شکۆهو سەربڵندیی ڕوویان لە مسرّەتی ظفر وەك ئافتابی عالەمی تاب ئەدرەوشا —ئافتاب، واتە: خۆر، ڕۆژ- سەبەب بە إختلاف چییان لێهات سەرشۆڕ ڕەنگ تاڵ چاو حیز ژێردەست ئەسیر زبان درێژی دەستکورت! ب٦، ص(١١،١٠).

هەڵبەتە دوایی باس دەکەم، کە مامۆستای گەورە زمانی زبرو تیژە، واش پێدەچێ، کە عورفی ئەوکات جێی ئەو جۆرە تەعبیرانەی تێدا بووبێتەوە! هەر بەو موناسەبەوە، دەڵێ:

ئەگەر عیززت دەوێ هەستە بە هیممەت
بە فیکرو سەبرو تەدبیرو کیاسەت
ئەبێ میللەت هەموو یەکبن لەگەڵ یەك
لە ئەربابی قەڵەم تا خاوەنی چەك

## پێنجەم: خۆپاراستن لە بێدینی و لاساییکردنەوەی بێگانە:

سەرنج بدەن بە پێچەوانەی ئەوەی، کە بۆ مامۆستای گەورەی کۆیە هەڵبەستراوە، کە گوایە یەکەم کەس بووە ڕەواجی داوە بە جۆرێك لە عەلمانییەت‌و سیکۆلاریزم‌و لاساییکردنەوەی ڕۆژئاواو ئەورووپا، نەخێر بەپێچەوانەی ئەوەوە دەبینین، بۆ وێنە لەوبارەوە:

* لە تەفسیری ئەم ئایەتەی قورئاندا کە دەفەرموێ: ﴿...قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾ الأعراف﴾، واتە: پێمان گوتن ببن بە مەیموونی زەبوون و ڕیسوا، دەڵێ: (موسڵمانی ئێستا عجایبن! قسەیێ لە عالمێ طبیعي أوروپی ببیەن -ببیستن- دەرحاڵ قبووڵی ئەکەن! ئەمما ئەگەر حکمێ لەوە نزیکتر لە رسولێ نقلْ بکرێ، بڕوا ناکەن! گوایە ئەوانە فەیلەسووفن. ب٣، ص٢٧١.

هەروەك ئەو دەردە عەلمانییەتەی، کە ئێستا هەیە ئەو جۆرە غەرب زەدەگییە، دیارە هەر لەو کاتەوە کەوتۆتە نێو کۆمەڵگاکەمان!

* هەر لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿...وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ الكهف﴾، واتە: لە لایەنی خۆمانەوە زانیارییەکی تایبەتمان فێرکردبوو، دەڵێ: (..ئەوانەی کەمێ ئەبنە منەوومر -ڕۆشنبیر- بەجارێ لە دین دەرئەچن، بە سفاهت -گوناحکردن- مشغول ئەبن، سەد خۆزی خوندەوار نەبان بۆ خۆشیان و بۆ (أمة)یش قازانجتر بوو، مەلای چاکیش کەمن، یان نەمان، ئەوی هەیە لەبەر فقیری چی پێ ناکرێ، خوا خوایەتی لقمە نانەکی دەستکەوێ، بیکا بە قوتی لا یموت. ب٦، ص١٠.

## شەشەم: کوردایەتی و چارەسەری کێشەی کورد لە ڕوانگەی مەلای گەورەوە:

هەڵبەتە ئەم دێرە شیعرەی جەنابی مەلای گەورە زۆر بەناوبانگە کە لەوبارەوە دەڵێ:

هەتــا دەمرم لەبــۆ کوردان دەنــاڵم

عیلاجیـان چۆن بکـەم هاوار بە ماڵم!

* لـە تەفـسیری ئـەم ئایەتــەدا: ﴿...وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٧﴾ الصف﴾، دەڵێ: (کوردیش لەسەر ئەم تەفرەقە بویتـە ئـاردی نـاو دڕی —دڕك- (قابـل)ی یـەکگرتنیان نیـە، چـارە (إتحـاد)ە، لەگـەڵ عرەب لەگەڵ تـورك لەگـەڵ إیـران، بـە شـرطي بقـای لوغـەتو بـە بعـضی عنعنـاتی قـومی تـضیقیان نەکـەن بـۆ تعریـبو تتــریكو تفـریس - واتـە بـە مـەرجێك عـەرەبو تـوورکو فـارس لێگـەڕێن کــورد بــە زمــانی خــۆی بــدوێو بــە دەمارگیــریی نەتــەوەیی نارەحــەتیان نەکــەنو نەیانکەنــە هــاووڵاتی پلــە دووو ســێ، وە ناچاریان نەکـەنو تـەنگیان پـێ هەڵنەچنن لـەپێناو کردنیـان بـە عەرەبو تورکو فارس!-.

ئەگەر إنصاف بکەین هەمووومان موسڵمانین، رابطەی دین کافیە بۆ تألیفی بێن، إیمانێ پاك شێرازە بەندی چاکە. ب١٠، ص٩٠.

واتە: ئەگەر هەموو گەلانی موسڵمان بە هەموو شێوەو ڕەنگـو زمانەکانیــەوە لەگــەڵ ئیــسلامدا ڕاســت بکــەین بەســە بۆئــەوەی پێکمانەوە ببەستێ!

* هەر لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتـە : ﴿...إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴿١١﴾ الرعــــد﴾، دەڵــێ: (یــەکێ لــە سەرامەدانی دزەیی -ڕیش سپیانی عەشیرەتی دزەیی- لێمی پرسی: ئێمە لەم ذلتە نجاتمان نەبێ؟ وتم بەڵێ ئەمـما بە شرط:

أولاً: جمعێ لە رجالی سیاسە، تام السیاسە.

ثانیاً: جمعێ لە ملایانی حفاظي روحی إسلامەتی، پاش تصفیە لە أخلاط و موادی ردیە.

ثالثاً: جمعێ مخترع خاصةً لە أسلحەدا، جمعێ دەست لەو ئەرزە گیرکەن محصولی نباتیو معدنی بەدەست خەن، ئەو (خزائن)ە، ئەو (دفائن)ە طبیعیة بە خۆڕایی نەڕوا،نەکەوێتە دەست أجانب وإلاّ دەها تدنّی ئەکەین! ب٥، ص٥٧.

واتە پێم گوت: بەو سێ مەرجە ئێمە میللەتی کورد لەو دەردەسەریی‌و سەرگەردانییە ڕزگارمان دەبێ: پیاوانێکی سیاسی مشورخۆر، کە بە ڕاستی سیاسەتمەدار بن، لەگەڵ کۆمەڵێك زانای ئیسلام کە باش لە ئیسلام شارەزا بن لە ڕووی قورئان‌و سوننەتەوە، نەك لە ڕووی ئەوەی تێکەڵ بە قورئان‌و سوننەت کراوە، وە کۆمەڵێك خاوەن پیشەی شارەزا، ئەوانە هەموو یەك بگرن، دەتوانن ئەو میللەتە ڕزگار بکەن، کە بێگومان زۆر جوانی لێ حاڵی بووە!

## حەوتەم: خێزان‌و ئافرەت:

شتێکی مەشهوورە کە مامۆستای گەورە یەکەم کەس بووە کچی خۆی (نجیبە خان)ی ناردوە بۆ قوتابخانە، کە بێگومان وەنەبێ شتێکی خراپی کردبێ، چونکە لە ئەسڵدا هەوڵدان‌و پەیداکردنی زانیاری (طلب العلم) فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەڵام گرنگ ئەوەیە بە ڕاستی زانیاری بێ‌و بە هیچ شێوەیەك دین‌و ڕەوشتی چاکی لە بەرانبەردا نەدۆڕێندرێ، کە زانیاری‌و زانست بۆخۆی ئینسان ناچار نیە بۆی دەستبەرداری دین‌و ئەخلاق بێ،

بەڵکو عیلمی ڕاستەقینە وا لە ئینسان دەکات، دین‌و ئەخلاقی هەبێ‌و کەسایەتیی خۆی بپارێزێ!

* لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿...إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾ الأحزاب﴾، دەڵێ: (با هەموو عالەم بزانێ ژن لە نظر دینی ئیسلام زۆر محترمە (حجاب)ی بۆ (حفظ)ی حرمەتە وەکی شووشەوات لەناو صندوق دادەنرێ، تا بە سەلامەتی بگاتە جێ، ژن ئەوەندە بە حرمەتە دینی ئیسلام بە ملیۆنێ لیرە ڕێ نادا ژنێ بە ڕووتی رقص‌و سەما بکا لەبەرچاوی خەڵکی، سەیری ئەورووپاییان بکەن هەڵیانئەپەڕێنن وە پێیان ئەڵێن: سیدات، تمام! ب٨، ص٦.

* هەروەها لە تەفسیری ئەم ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿...وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ ...﴿٣١﴾ النور﴾، واتە: با جوانی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی بە عادەت دەردەکەوێ، دەڵێ: (ئەورووپاییەکان پەکیان بە نامووس‌و شەرەف نەکەوتیە، خۆی لە وڵاتێ، ژنی لە وڵاتێ، لەکن دۆست‌و أحبابیان بۆ سیاحەت ئەچێ، بەڵام لەسەر مسرح بەو نوعە سفورە رقص ئەکا پارە پەیا ئەکا، گۆڕ هەڵتەکێنە عبدالله بن سلول ئەمرۆ ڕۆژی تۆ بوو بوو بای بە مسرح چی پارەت پەیا ئەکرد، ئەی أمة! بە قسەی أورووپاییان هەڵمەخەڵەتێن! لەبەر سفوری هکذایی ڕۆژی چەند وقائع‌و فقائح ڕوونەدا. ب٦، ص١٦٩.

مامۆستای گەورە جوانی گوتوەو قسەکانی زۆر بەجێن، بێگومان لە ئەنجامی ئەو هەموو بەرەڵڵایی‌و بێ‌بەندو باریی‌و داڕووخانی

ڕەوشتەدا چەندەها (وقائع)، کە دەبێ بچێتە بەردەم دادگاو، (وقائح) شتی ناشیرین، کە ناچێتە دادگا ڕوودەدات!

## هەشتەم: گرنگی پەروەردە:

* لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ... ٦ التحريم﴾، دەڵێ: (حقيقة اساس لە تربيەی افراد هەڵدەستێ، افراد بێتربيە بن، شراب خۆرو قومارکەرو دوای هوای نفس بکەون (تدبير المنزل) کوو ئەبێ؟ -واتە چۆن ماڵ بەڕێوەدەچێ- (نفوس) بێتربيە بێتدبيری جماعەتی يعنی سياسەت کوو ئەبێ؟ قانونی دولی زۆر غلطن، ذاتاً ئەوەی واضعي قانونە خۆی مێلی منحرفە! ب١٠، ص١٦٤.

ڕاستە دەڵێ: ئەگەر خەڵك پەروەردە نەکرێ، وەزعی سیاسی هیچی بەسەر هیچەوە نابێ، هەموو دەبێتە گەندەڵ چیو بەرتیل خۆرو دز، ئینجا دەڵێ: زۆرجار ئەوەی قانوونەکە دادەنێ، خۆی پێشێلی دەکاتو لێی لادەدات، جا دەبێ قانوونەکەی چۆن دابنێ!

## نۆیەم: گرنگی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە:

* مەلای گەورە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- لەبارەی ئەم فەرزە گەورەیەی ئیسلام فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەوە، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ... ١٧ لقمان﴾، دەڵێ: (نوێژ بۆ إكمالی

نفسی خۆی، أمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بۆ (إكمال)ی غیر، توحید رأسی معروفانە، شرك مداری منكراتە، امة بە أمر بە معروف‌و نهی لە منكر ئەبێتێ، حسناتیان زۆر ئەبێ سیئات کەم، ئەگەر ترك کران، هەرکەسێ سەگە بەرەڵڵایە ئەبێ ئەوەی بیکا ئەیکا. ب٧، ص١٥٢.

بۆچوونی مامۆستای گەورە زۆر جوانە دەڵێ: لەم ئایەتەدا کە خوا لەسەر زمانی لوقمان فەرمان بە کوڕەکەی دەکات: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ... ﴿١٧﴾ لقمان﴾، نوێژ بۆ ئەوەیە، کە خۆی تەواو بکات، فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەش بۆ ئەوەیە کە غەیری خۆی تەواو بکات‌و بژاری بکات‌و چاك‌و پاکی بکات، ئینجا دەڵێ: خوا بە یەکگرتن (التوحید) سەری هەموو چاکەیەکە، هەروەك هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)یش بناغەو ماك‌و میکرۆبی هەموو خراپەیەکە، پاشان دیارە ئوممەتی ئیسلامیی بە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە تەواو دەبێ‌و دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەوە نەما شیرازەی دەپچڕێ!

**دەیەم: ئیمان‌و کردەوەی باش لە یەك جیا نابنەوە:**

مامۆستای گەورە زۆر جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە، کە ئیمان بە بێ کردەوەی چاك نابێ، دیارە منیش لە کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، کە (٦) بەرگە زۆر بە درێژیی باسم لەوە کردوە، وە لە ڕاستیدا ئەوەی مورجیئەکان (المرجئە) لەنێو ئوممەتی ئیسلامیدا پەیدایان کرد، دەردێکی زۆر کوشندە بوو، واتە ئەوە کە ئینسان هەر

كە گوتی: ئیماندارو موسڵمانم، ئیدی تازە ئەوە ئیماندارو موسڵمانە! كە بەداخەوە زۆر كەسی خۆ بە موسڵمانزان بەو قسەو بۆچوونە فرپۆك‌و دوور لە ڕاستییە هەڵخەڵەتاون، كابرا هیچ ناوونیشان‌و دروشمێكی ئیسلامەتی لەسەر نیەو، لە هیچ شتێكدا ناچێتەوە سەر ئیسلام‌و هیچ حیسابێك بۆ ئیسلام ناكات، خۆشی بە موسڵمان دەزانێ! كە خوا خێری مورجیئەكان نەنووسێ ئەوان ئەو فیكرو بۆچوونەیان داهێناو بڵاویان كردەوە، كە كردەومیان لە ئیمان دواخست، بۆیە پێیان گوترا (المرجئة)، واتە: (أرجئوا العمل عن الإيمان)، جا مامۆستای گەورەش زۆر دژی ئەو فیكرەیەیە بۆ وێنە:

لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ٢٤﴾ الحاقة، دەڵێ: (وە لە حەقیقەتی حاڵیشدا ئیمان بێ (عمل)ی (صالح) فلسێ نایەنێ، كەوابێ كەسێ ئیمانی بە خواوەندی بێ شریك ببێ، وە بزانێ (رسول)ی بە حەقە، وە ڕۆژی جزا هەیە (مع هذا) ڕۆچێ لە گوناهان، وەك ئەوە وایە چاوی ساغ چ نەبینێ! بڵێم چی؟ ئەگەر ئیمان ئیمان بێ، صاحبی بۆ چاكە سَوق ئەكا، لە بەدیی ئەیگێڕێتەوە. ب١٠، ص٢٣٨.

كە بێگومان وایە، ئەگەر ئیمان ئیمان بێ بەرهەمەكەی لە خاوەنەكەیدا دەردەكەوێ.

## یازدەیەم: چۆنیەتی جێبەجێكردنی شەریعەت:

مامۆستای گەورەی كۆیە وەنەبێ بیری لەوە نەكردبێتەوە كە شەریعەتی خوا چۆن پیادە بكرێ‌و، چۆن وڵات‌و كۆمەڵگا بە شەریعەت چاكسازیی‌و پاكسازیی بكرێ!

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ... ﴿٢١﴾ الشورى ﴾، واتە: یان چەند هاوبەشێکیان هەن،کە لەجیاتی خوا بەبێ مۆڵەتی خوا، بەرنامەیان بۆ دادەنێن.

دەڵێ: (چارەی قانونێ مکمّل وائەبێ، کە عرضم کردینە: لە مذاهبي إسلامیە هەر مسألەیە أوفق وأرفق بێ -واتە گونجاوو نەرم بێ بۆ حاڵی خەڵك- بۆ (إنتظام)ی أنام (روح)ی حیاتی إجتماعی تیابێ بۆ تعالی و تنزّە سَوقي أمّە بکات -واتە بۆ بەرزیو پاکی پاڵ بە ئوممەتی ئیسلامییەوە بنێ- لە هەر مذهبێ بێ (قید)ی بکەن، قانونێ دێتە حصول: أتم، أکمل، أنفع، أدوم، أعمّ، محکم -واتە قانوونێکی تەواو، بەسوود، بەردەوام، گشتی، بەهێز- ئەتوانین بڵێین: ئەمە شەریعەتی إسلامییە و کاملّە وإلاّ هەر مذهبێ بە تەنێ تەواو نیە جزئێکە لە تەواوی شەرعی أحمدی. ب٩، ص٢٨.

هەڵبەتە مەبەستی پێ ئەوەیە، کە بە هەموو مەزهەبەکان ئینجا دەتوانین بڵێین هەموو فیقهی ئیسلامیی پێکدێنن، ئەگەرنا شەریعەت دەقەکانی قورئانو سوننەتە، بەڵام هەموو مەزهەبەکانو راوبۆچوونو ئیجتیهاداتی زانایان ئەو فیقهەو فەهمو تێگەیشتنە پێکدێنن، کە دەتوانین بڵێین: ئەو تێگەیشتنی موسڵمانانە دەربارەی قورئانو سوننەت! بەڵام شەریعەت خودی قورئانو سوننەتە! خوا لە مامۆستا مەلا عبدالکریم)ی (مودرس)یش خۆشبێ کە کاتی خۆی بەشێکی لە فیقهی مەزهەبی شافیعی ناونابوو: شەریعەتی ئیسلام!!

جا مامۆستای گەورە دەڵێ: دەبێ قانوون بەو شێوەیە دابنرێ، واتە: ناگونجێ وەزعی کۆمەڵگا بە مەزهەبێکی دیاریکراوو، تەنیا بە

ئیجتیهادی چەند زاناو شەرعزانێكی دیاریكراو بەڕێوەبچێ، بەڵكو دەبێ بۆ بەڕێوەچوونی وڵاتو كۆمەڵگا، زانایانی ئیسلام كۆببنەوەو بزانن كام ئیجتیهادو ڕاوبۆچوونە گونجاوترە ئەوە هەڵبژێردرێو ڕێكبخرێو بكرێتە قانوون.

## دوازدەیەم: طەریقەتو تەصەووف:

بەڕاستی مامۆستای گەورە تیری خۆی زۆر ئاڕاستەی طەریقەتو تەصەووف دەكات، بەڵام دەبێ لێمان تێكنەچێ مامۆستا مەبەستی لەو طەریقەتو تەصەووفە كە ڕەخنەی لێدەگرێ، ئەو جۆرەیانە كە لە شیرازەی شەرع چۆتە دەرێو بۆتە دینێكی سەربەخۆ، وەك ئەوەی كە هەندێك جۆرو شێوە عیبادەتی جیاجیاو سەربەخۆی هەیە، بەزمو ڕەزمو شتی تایبەتی خۆی هەیەو پڕیش كراوە لە شیركو بیدعەتو ئەفسانەو خۆڕافیات، وەك لە قسەكانیدا دەیبینین، ئەگەرنا مامۆستا - ڕەحمەتی خوای لێبێ- زۆر وەسفی پیاوانی هەڵكەوتووی ئەو بوارە دەكات، لەوانە مەولانا خالیدی نەقشبەندیو كاك ئەحمەدی شێخو چەندین شێخانی دیكەی سەردەمی خۆی، بۆ وێنە:

* لە تەفسیری ئەم ئایەتانەی سووڕەتی (الفتح)دا: ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ ... ﴿١٦﴾ الفتح﴾، دەڵێ: «وە (كذا) مەولانا خالد، كە مایەی إفتخاری كوردانە طریقەی نقشی هێنا نێو كوردان، زەمانی وی زۆر باش بوو، حتی ملایەكی وەك باپیر (ملا عبدالله الجلی)یم وە مەلای وەكی (ملا یحیی)ی مزووری، طریقیان لێ وەرگرتو لە بەرەكەت غایة مستفید بوون، أمّا زۆر نەچوو تێكیاندا كەوتە دەستی نا أهلان جهلایان خصوص

شەدەڵەیی بەجارێ لە شیرازەی دین‌و شەرەف‌و ناموس‌و غیرەتی بەشەریی دەرچوون، ناوی کوردیان لەکەدار کرد﴾ ب٩، ص٢١١.

هەڵبەتە ماموّستای گەورە لە تەفسیرەکەیدا زۆر باسی شەدەڵەییەکان دەکات، واتە شێخ عبدالکریم‌و مامە ڕەزاو ئەوانە، کە لە ڕاستیدا شتی وایان داهێناوە زۆر سەرسوڕهێنەرەو هیچ پەیوەندی بە دین‌و ئیسلامەتییەوە نەبووەو نیە!

وە لەبارەی شەدەڵەییەکانەوە شت زۆرە، برای بەڕێزمان کاك (د.جواد ملا حمدامین چۆم حەیدەریی) لەو کتێبەی، کە نامەی ماجستێرەکەیەتی بە ناوونیشانی (محمد بن عبدالله الجلی -مەلا گەورە- وجهوده العلمية)دا بە درێژی باسی هەڵوێست‌و بۆچوونی ماموّستای گەورە دەکات، دەربارەی ئەو جۆرە بەناو طەریقەت‌و تەصەووفەی، کە لە نێو شەدەڵەییەکانەوە سەری هەڵداو، پاشان بۆ شوێنانی دیکەش چووە.

* هەر لەبارەی طەریقەت‌و تەصەووفەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ ...﴿٨٧﴾ المائدة ﴾.

دەڵێ: (دین لە ئێوە تربیەی نفس‌و تزکیەی ئەوێ (تعذیب وتذلیل)ی ناوێ، صوفیەی ئێمە هەڵخەڵەتان بە ڕەهبانیەتی مسیحی بۆ دینی ئیسلام زۆر زەرەر بوو، شتی خۆش بخۆو بخۆوە، ژن بێنە، ئەولاد بەخێو بکە، امّا لدى الإيجاب روح‌و أولاد مال‌و نفس‌و نفیس، لە ڕێی خوا صرف بکە) ب٣، ص٧.

واتە: ئەوانەی زۆر پابەند نەبوون بە شەریعەتو چاك تێگەیشتوو نەبوون لە قورئانو سوننەت لە ئەهلی طەریقەتو تەصەووف لای خۆمان کەوتنە ژێر کاریگەریی گۆشەگیریی (الرهبانیة)ی نەصرانییەکان، مامۆستای گەورە جوانی لێ تێگەیشتوە، بۆیە دەڵێ: ژن بێنە، منداڵ بەخێو بکە، شتی خۆش بخۆو بخۆوە، بەرگو پۆشاکی جوانو چاك لەبەر بکە، بەڵام ئەگەر پێویستی کرد ڕووحوماڵو منداڵو هەرچی هەتە لە شتی بەنرخ لە پێناوی دینی خوادا بیبەخشە!

* هەر لەوبارەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ الأنعام﴾، واتە: بلێ هەر خوایە کە لەو بەڵایەو هەر بەڵایەکی دیکەش دەربازتان دەکات، دوایش هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.

شتێکی خۆش دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (ئەو ساڵە کە بۆردومان کراین -وادیارە جەنگی جیهانیی دووەم بوو بێ- أوّل ڕۆژ لە کۆیە أهوالو شدائدم مشاهدە کرد أوّل نوبە هەڵئەهاتین لە هەیوان بۆ ژێر کۆشك، یەکێ ئەیوت: یا غوث یا غوث یا غوث و غاردی ئەدا -مەبەستیان بە (غوث) شێخ عبدالقادری گەیلانییە، ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە هەر بۆ خۆی وشەکە هەڵەیە، چونکە ئەوەی لە فریای داماوان دێو (غياث المستغيثين)ە بە تەنیا هەر خوایە-من وتم: یا غوث یا غوثی چی پێ ئەوێ، ئەمڕۆ خۆیشی -شێخ عبدالقادری گەیلانی- لەگەڵمان با هەڵئەهاتو بۆ کونێ خۆی ئەشاردەوە!

دوایی ئەو قسە گەیشتبۆوە (سید شێخ محی الدین) خودا عافوی بکا -دیارە شێخێکی ناوداری هاوچەرخی خۆی بووە- فەرمووو بووی: فلان زۆر بێ مبالاتە چۆن ئەو نوعە قسە دەربارەی (غوث) ئەکا!

ئەویش لە گوندی (ناصر ئاغا)ی ئەشکەوتێ هەبوو سبەینێو ئێوارە کە طیارة بۆ سەر کۆیە ئەهات، لەو ئەشکەوتە خۆی ئەشاردەوە، پاشی بەینێك ملاقاتمان کرد، پێم وت: تۆش (محی الدین) لە عەینی خانەدانی -نازناوی شێخ عبدالقادری گەیلانی (محی الدین) بووە، واتە تۆش هەر لە هەمان بنەماڵەی پێغەمبەری ﷺ - بۆچی لە ئەشکەوتی پشیلان خۆت ئەشاردەوە؟ پێغەمبەر لەبەر قورەیشیان هەڵات لە (غار) خۆی شاردەوە، مع أنە نە طیارەیان هەبوو، نە بۆمبا، ئایا تۆ (غوث) لە پێغەمبەر بە زیاتر دەزانی؟ بە بەردێ بریندارو ددانی شکا! غوث بەر بۆمبا بکەوێ زەرەری پێ ناگا؟!) ب٣، ص٨٣.

* هەروەها لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ الزخرف﴾، واتە: ئەگەر یەکێکیان مژدەی پێدرا بەوەی کە بە وێنە هێناویەتەوە بۆ خوا -دەیانگوت: فریشتەکان کچی خوان، واتە ئەگەر مژدەی پێدرابا، کە کچت بووە - دەموچاوو ڕوخساری تاریك دەبووو ڕقی هەڵدەستا.

دەڵێ: (شخصێ هەبوو گێژو وێژ زاتێ -ڕەحمەتی لێبێ- فەرمووی: -واتە شێخێکی ناوداری ئەوکاتە- لام وایە ئەوە (ولی)یە، وتم: ئەگەر کەسێ بڵێ: ئەوە برای تۆیە پێت خۆشە؟

فەرمووی: نا، وتم: ئەدی خوا کوو ڕاضی ئەبێ بڵێی: ئەوەی (ولی) خوایە؟! ب٩، ص٦١.

بە ڕاستی قسەیەکی زۆر جوانە، تۆ کەسێکت پێ لەوە نەوەشێتەوەو بە شایستەی ئەوەی نەزانی بڵێین: ئەوە براتە، چۆن پێت لەوە دەوەشێتەوەو بە شایستەی ئەوەی دەزانی، کە بڵێین: ئەوە دۆستی خوایە؟!

هەڵبەتە وەك ئامـاژەم پێدا مامۆستای گەورە زۆر بەڕێزو تەقدیرەوە باسی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی‌و کاك ئەحمەدی شێخ دەکات، بۆ وێنە لە شوێنێکی تەفسیرەکەیدا باسی ئەوە دەکات، کە (مەلا ئەحمەدی کۆر) یەکێك بووە لە مامۆستایانی شاری کۆیە پیاوێکی زۆر صالح بووە بە پێی ئەوەی کە مامۆستا زۆر لێی ڕازی بووە، جارێك ئەو مەلا ئەحمەدە بۆ مامۆستای گێڕاوەتەوە دەڵێ: لە کاتی گەنجێتیمدا لە سلێمانی بووم ڕۆژێك هاتە دڵم ئایا دەبێ ئیمان‌و کردەوەی ئێمە بە چ تەرازوویێك هەڵدەسەنگێندرێ، ئیمان‌و کردەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و دۆستانی خواش هەر بەو تەرازووە هەڵبسەنگێندرێ؟ دەڵێ: چووم بۆ دەشت‌و ماوەیەك لە دەرودەشت مامەوە بۆم ئیشکال بوو، وادیارە حاڵەتێکی وەجدی ڕووحیی بەسەردا هاتووە، دەڵێ: دوایی هاتم لە مەجلیسی کاك ئەحمەدی شێخ دانیشتم، کاك ئەحمەد گوتی: ئاشەوان شێلم‌و زێڕ چۆن بە یەك تەرازوو هەڵدەکێشرێن؟!

دەڵێ: منیش شەرمم لێکرد، وەك بڵێی زانیویەتی کە خوای پەروەردگار ئەوەی خستۆتە دڵی کاك ئەحمەدەوە، جا ئەوە مامۆستای گەورە وەك جۆرە کەرامەتێك لە کاك ئەحمەدەوە دەیگێڕێتەوە.

شتێکی دیکە هەر لە کاك ئەحمەدەوە دەگێڕێتەوە کە لە بابی ڕوویداوە، واتە لە (مامۆستا مەلا عبداللە)ی بابی مەلای گەورە، دەڵێ: بابم گوتی: لەگەڵ کاك ئەحمەد پێکەوە بووین لە بەغدایە، دیارە هاوتەمەن بوون، دەڵێ: ئەو شتی دەنووسیو دەیگوت: مەلا عبداللە تۆش هاوکاریم بکەو پێیدابچۆوەو بۆم پاکنووس بکە، دەڵێ: هەموو جارێ منیش شتەکانم بۆ دەنووسینەوەو هەڵەی ڕێزمانیی (قواعد)م لێ دەگرت، دەڵێ: جارێك زۆر خۆی بە شتێکەوە ماندوو کردبوو، گوتی: مەلا عبداللە ئەگەر زیرەكو ئازای ڕەخنەم بۆ لەوە بگرە! واتە هیچ هەڵەی قەواعیدیی تێدا نیە، دەڵێ: منیش تەماشام کرد هەر لە لاپەرەیەك چەند ڕەخنەیەکم لێگرتو گوتم: قوربان ئەوەتا فەرموو ئەوە چەند ڕەخنەیەك، ئەویش گوتی: کاکە تۆ چاوت لە من تیژترە دەنا ئەوانە هەڵە نینو حیسابی ناکەم، دەڵێ منیش گوتم: قوربان نا ئەوە شتێکی دیکەیە، گوتی: چیە؟ گوتم: ئینسان عەیبی خۆی نابینێ، بەڵکو غەیری خۆت عەیبەکان باشتر دەبینێ!

دەڵێ: کاك ئەحمەد ماوەیەکی باش گریاو گوتی: بەخوا مەلا عبداللە ڕاست دەکەی ئینسان عەیبی خۆی نابینێ! مەبەست ئەوەیە مەلای گەورە ئەو بەسەرهاتە، وەك وەسفی کاك ئەحمەدی شێخو پیاوانی گەورەی طەریقەتو تەصەووف ئاماژە پێدەکات، لە تەفسیرەکەیدا.

## سێزدەیەم: ڕەخنە لە وەهابییان:

هەڵبەتە ئەو کەسانەی لەم ڕۆژگارەدا پێیان دەگوترێ: سەلەفیی، ئەوکاتە زیاتر هەر پێیان گوتراوە وەهابیی، جا سەیر ئەوەیە کە

مامۆستای گەورە هەر بۆخۆی لە لایەنی هەندێك مەلایانەوە بە وەهابیی ناوزەد کراوە! وەك لە شیعرێکدا دەڵێ:

مەلا گەر بێ و بڵێ: نابێ وەهابی

دەڵێن ئەو فاسیقە بۆتە وەهابی

وەهابییشیان بە جۆری کردوە تەڵقین

وەهابیی یانی: بێ ئایین و بێ دین

مامۆستای گەورە بۆ خۆی تۆمەتبار بووە بەوەی کە وەهابییە، بەڵام ڕەخنە دەگرێ لەو زانایانەی کە لە سعوودیە بوون، هەڵبەتە زیاتر بە زانایانی ئەوێ گوتراوە وەهابیی، واتە ئەوانەی کە شوێنکەوتووی (محمد بن عبدالوهاب) بوون، نەك بەو مەفهوومەی کە ئێستا بەکاردەهێنرێ!

لەوبارەوە لە تەفسیری سوورەتی (التكاثر)دا دەڵێ: (خۆزی مەلای وەهابییان تۆزێ هاتبانە سەر عقڵ بە چاوی إعتبار تەماشای أحوالاتی حاضرەیان کردبا، لەبەر لاپەڕە کاغەزی روایات محروم نەبان لە مطالعەی صحائفی أیام! مەلای ئەو عصرە بان، نەك مەلای سێزدە قرن پێش ئەمڕۆ، قیدی سوننەت و بدعەتیان لەسەر قواعدو نوامیسی إدارەی ملك و حفظی مملکەت و إدامەی عزّ و سلطنەتی إسلام، هەڵگرتبا..). ب١٠، ص٦٣٥.

بەڕاستی مەلای گەورە باش لە مەسەلەکە تێگەیشتوە، بێگومان بیدعەت لە عەقیدەو عیبادات دایە، جا تەماشای ئێستا مەکەن بەڵکو کاتی خۆی کە هێڵی شەمەندەفەریان بردوە بۆ ئەوێ، زانایانی سعوودیە گوتوویانە: ئەوە بیدعەتە! هەروەها وێنەی فۆتۆگرافیی و هەرچی ئامێرو دەزگای تەکتۆلۆژیایە بە بیدعەتیان داناوەو کتێب و نامیلکەیان

لەسەر نووسیوە، دوایی زانایانی میسر بەرپەچیان داونەوە، جا لەو سەروبەندەدا بووە جەنابی مەلای گەورە دەڵێ: خۆزگە ئەوانە تۆزێك هاتبانە سەر عەقڵو موتاڵەعەی كتێبان، بێئاگای نەكردبان لە موتاڵەعەی ڕووداوەكانی ڕۆژگار، وە قەیدی سوننەتو بیدعەتیشیان لەسەر مەسەلەی حوكمو سیاسەتو ئیدارەی وڵاتو كۆمەڵگا لابردبایە، چونكە بێگومان ئەوە لەبازنەی دەستكراوەیی (مباح) دایە!

وە بۆ زانیاریتان مەلای گەورە زۆر بەڕێزەوە باسی (إبن تیمیة) و (إبن القیم الجوزیة) دەكات ڕەحمەتی خوایان لێبێ، دەشڵێ: پێموایە لە مەلای كوردان من یەكەم مەلام كتێبەكانی (إبن تیمیة)م خوێندبێتەوە!

ڕەخنەش دەگرێ لە (إبن الحجر الهیتمي) خاوەنی كتێبی (تحفة المحتاج) كە شەرعزان (فقیە)ێك بووە، نەك (ابن حجر العسقلاني) فەرموودەناس (محدث)، دەڵێ: (إبن الحجر الهیتمي) خوا عەفووی بكات بە فەقێی (ابن تیمیة) ناشێ كەچی فەتوایەكی داوە كە بەو هۆیەوە هەرچی مەلای كوردەوارییە مەحرووومی كردوون لە موتاڵەعەو سوودوەرگرتن لە كتێبەكانی (ابن تیمیة)، كە زانایەكی زۆر بلیمەتو موعتەبەر بووە!

**چواردەم: ڕەخنە لە مەلایان:**

بۆ وێنە:

* لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ٧٦﴾ التوبة، بەسەرهاتی (ثعلبة) دێنێ، كە هەڵبەتە لە ڕووی (سند)یشەوە بەهێز نیە، گوایە لە سەردەمی

پێغەمبەردا ﷺ کابرایەك بەناوی (ثعلبة) پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەوڵەمەندیی بۆ کردوەو دەوڵەمەند بووە، دوایی زەکاتی نەداوە، ئینجا لە سەردەمی (ابوبکر) و (عمر)دا -خوا لێیان ڕازی بێ- زەکاتی لێ وەرنەگیراوە، بەهەر حاڵ بەسەرهاتەکە درێژە، جا مامۆستای گەورە باسی ئەوە دەکاتو بەو بۆنەیەوە دەڵێ: (سببی مَیلي علماي دین بۆ فقرو زهد إستیلای رهبانیەتە، لایان وایە دەوڵەمەندی موجبی غضبي خوایە عاقبەتی وخیمە، سەر ئەکێشێتە کفرو نفاق، بەڵام لەو فکرە إصابەیان نەکردوە، دینی إسلام لەگەڵ فقر ناژی، وە نەژی!...). ب٤، ص٧٨.

ئەم شیعرەی مامۆستاش هەر لەوبارەوە بەناوبانگە کە دەڵێ:

ئەوەی دنیای نەبێ دینی زەعیفە

مەلا بێ یا نە شێخ یاخود خەلیفە

مەداری دینو دنیا هەر غینایە

بڵێ: (الفقرُ فخری) ئیفتیرایە

مەبەستی ئەوەیە شتێك دەگێڕنەوە گوایە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ کە دەڵێ: (الفقرُ فخری)، بێگومان ئەوە شتێکی ئیفتیراو هەڵبەستراوەو هیچ (سند)ێکی نیە، وە لەگەڵ ڕووحی ئیسلامیش ناگونجێ، وە فەقیری بەڵایەکە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کوفردا پەنای لێ بە خوا گرتووە، کە دەفەرموێ: ((اللهم إني أعوذ بك من الکفر والفقر)) رواه ابو داود و صححه الحاکم ، ووافقه الذهبي عن ابي بکرة، واتە: خوایە پەنا دێنمە بەر تۆ لە فەقیریی‌و لە کافر بوون!

* هەر دەربارەی ڕەخنەگرتن لە هەندێك شتی مەلایان، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ... ﴿٨٠﴾ النمل ﴾، باسی تەلْقین دەکاتو دەڵێ: (أمّا ملای تلْقین خوێن ئەوەندە ئەشیرێنێ لەناو قبری مردی گوێی لێ ئەبێ؟! من گەلێ جار بە موسڵمانان ئەڵێم: ئەو (تلقین)ە بۆ زیندییان زۆر باشە... ئەگەر (مؤمن) بێ، بێخەمیشە جواب ئەداتەوە، وإلاّ نەڕەنەڕی ئێمە فایدەی نیە). ب٧، ص٩٨.

زۆر ڕاستە ئەو کەسەی بە زیندوویی وەرینەگرتبێ، تازە دوای مردن لێت وەردەگرێ؟! بێگومان نەخێر!

هەروەها کۆمەڵێك شتی دیکەش لەسەر مەلایان دێنێو ڕەخنە دەگرێ کە زۆر خۆیان بەستۆتەوە بە هەندێك فەتواو ڕاوبۆچوونو فیقهی زانایانەوە، کە بۆ کاتی خۆی چاك بووە، بەڵام بە کەڵکی ئێستا نایەو بۆ ئەم ڕۆژگارە نامۆیە.

بۆ وێنە: ڕەخنە دەگرێ دەڵێ: مەزهەبی ئیمام شافیعی -ڕەحمەتی خوای لێبێ- سێ شت لە نێو کورداندا دوای خست:

<u>یەکەم</u>: موقارەنەی نییەت.

<u>دووەم</u>: دیاربوون لە کڕینو فرۆشتن (بیع).

<u>سێیەم</u>: عەدالەت لە شاهیدی گرێ بەستی هاوسەرگیری (النکاح).

جا دوایی دەڵێ: باشە مەزهەبێك نوێژی پێنەکرێو، نیکاحو طەلاقی پێ نەکرێو کڕینو فرۆشتنی پێ نەکرێ، چۆن لەنێو ناچێ؟!

هەڵبەتە هەندێك فەتواو بیروڕای زانایانێك هەبوون، كە لە ڕاستیدا لە ئەسڵی مەزهەبەكەشدا نەبوون، نەك لە ئەسڵی شەریعەتدا نەبوون، جا ئەوە شكستێكی گەورە بووە، بۆ وێنە: (مقارنة النية) مەبەست پێی چیە؟

من خۆم زۆرجار هەندێك لە مامۆستایانم بینیوە، كە وەسوەسەی زۆری بۆ پەیدابووە لەكاتی نوێژ دابەستندا، چونكە لە هەندێك لە كتێبە فیقهییەكاندا هاتوە دەڵێ: لە كاتی دەربڕینی (أ)ی (الله) تا (ر)ی (اكبر) دەبێ بە دڵیدا بێ، چ نوێژێكەو، چەند ڕكاتەو لەگەڵ كێی دەكەی‌و چۆنی دەكەی‌و، بۆ كێی دەكەی! ئینجا جاری وا هەیە ئەو (مقارنة)یەی بۆ ناكرێ‌و ئەو هەموو بەراوردەی بۆ ئەنجام نادرێ، بۆیە لێی دەبێ بە دڵەڕاوكێ‌و وەسوەسە، بۆ خۆم مامۆستای وامدیوە هەر گوتوویەتی: نیەتم هەیە، نیەتم هەیە، پەنجا جار گوتوویەتی نیەتم هەیە، نیەتەكەی هەر بۆ نەهاتوە!

وەك دەڵێن: جارێك مامۆستایەك هەر گوتوویەتی: نیەتم هەیە، نیەتم هەیە، مامۆستایەكی دیكەی لەدواوە بووە، یەكسەر قۆڵی گرتوەو لای بردوەو گوتوویەتی: قوربان تۆ نیەتت نیە، من نیەتم هەیە، ئیدی نوێژەكەی دابەستوەو تەواو!!

یان بۆ وێنە: دادگەریی شاهیدیدانی كاتی مارەبڕین (عدالة الشهود)، گوتراوە: دەبێ شاهید عادل بێ، دوایی ناچاربوون گوتوویانە: دەبێ خۆت تەقلیدی مەزهەب‌و فەتوایەكی دیكە بكەی! دەجا خۆ دیارە عەدالەتی ڕەها (مطلق) هەر لای خوای پەروەردگارە.

## پازدەیەم: وریابوون لە سیاسییەکان:

هەڵبەتە لەوەدا ئامۆژگاری مامۆستایان (مەلایان) دەکات، لەوبارەوە لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿...إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ ...﴿٣٤﴾ النمل﴾.

دەڵێ: (لە دسیسەی سیاسییان بە حەذر بن، بە وەعدەیان هەڵمەخەڵەتێن، یەك دوو ڕۆژان بۆ ناوداران بە قەشمەریی حورمەت ئەنوێنن بۆ إحترامیان تۆ پێش ئەهاوێن -تۆ پێش دەخەن-، أمّا زۆر ناچێ ئەیانکەنە ئەسیر، وەك دزو ڕێگران حەپسیان ئەکەن، ڕەزیل و بێحورمەتو ماڵوێران...). ب٧، ص٨٠.

مامۆستای گەورە پیاوێکی خاوەن ئەزموون (مجرّب) بووە، ڕاستە زۆر لە سیاسییەکان هەتا مەداری خۆیان بە کابرا ساز دەکەن، بە تایبەت بە مامۆستاو زانایانو ئەهلی عیلم، لە خۆیانی نزیك دەخەنەوە، دواتر کە ئیشیان پێیان نەما یەکسەر وەك داری ناپێویست بە دیواری هەڵیدەپەسێرنو دوایی کەس پێی ناڵێ: مامۆستا خەڵکی کوێی؟ کە لە مێژووی دوورو نزیکی خۆماندا زۆر مامۆستاو مەلای ناودارمان بینین وایان لێهاتو بەو دەردە چوون! جا دەڵێ: ئاگاتان لەو جۆرە سیاسییانە بێ هەڵتان نەخەڵەتێنن[1].

---

١) هەندێك مەلا هەبوون ڕێزو ئیعتبارێکی باشیان لەنێو مسوڵمانانندا هەبوو، بەڵام دوایی خۆیان سووك و بچووك کرد، لەبەرئەوەی بە قسەی مەلای گەورەو هاووێنەکانییان نەکرد!

# تەوەری سێیەم:

## هۆکارەکانی پووکانەوەی موسڵمانان و بنەمایەکانی بووژانەویان

با بزانین لە ڕوانگەی مامۆستای گەورەوە، هۆکارەکانی بەجێمان و پووکانەوەی مسوڵمانان و ئوممەتی ئیسلامیی چین؟ وە پاشان مەلای گەورە پێی وایە هۆکارەکانی بووژانەوەو هەڵسانەوەی ئوممەتی ئیسلامیی چین و، موسڵمانان چۆن بەرەو پێش دەچن و لەم واقیعەی تێیکەوتوون ڕزگاریان دەبێ؟

### أ- هۆکارەکانی بەجێمان و پووکانەوە:

مامۆستای گەورە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- لە کۆتایی تەفسیرەکەیداو لە تەفسیری سووڕەتی (النصر)دا، هۆکارەکانی بەجێمان و پووکانەوەی ئوممەتی ئیسلامیی و لەنێویشیدا گەلی کوردیش باس دەکات، دیارە بە چوار هۆکار باسی دەکات کە بەڕاستی جێی سەرنجن، لێرەدا مـن دەقی وتەکانی خۆی دێنم، کە دەڵێ:

<u>أولاً</u>: بە عمومی ڕوویان لە حسیات و طبیعەت وەرگێڕا (ترک)ی فیکرو نظریان کرد، کەوتنە عالمی غیب و خیاڵ و فڕین، عطالەت و کسالەت، لای شیعە إمامی معدوم یان موهوم، لای صوفیە (قطب)ی (فرد) مدبّری کائنات!

ثانیاً: (سلب)ی قدرەو إرادە لە ئینسانو سَوق بۆ مردن، ئەمڕۆ سبەی قیامەتە...

ثالثاً: (تسلیم) قضا و قدر هەرچی بەسەرمانبێ با بێقضاو قدری خوایە وایە...

رابعاً: مسئلەی قومیت بەجارێ رابطەی دینی نەهێشت –سەیر لەوە دایە وا باوە، کە مامۆستای گەورەی کۆیە زۆر قەومیی بووەو بیری ناسیۆنالیستی زۆر بەهێزبووە!-

خۆزی بەڕاستی قومیەتەکەش بووبا مع الأسف ئەویش نیە، لە مادیاتو معنویات محروم بووین، أمّا گەڕانەوەیان بۆ دین زۆر (مشکل)ە، زۆر نفرەت لە دین ئەکەن، سفالەتو ژێرکەوتنی خۆیان لە دین ئەزانن، -مەبەستی پێ ئەو کۆلکە ڕۆشنبیرانەی سەردەمی خۆیەتی، کە ئێستاش کۆلکە ڕۆشنبیری لەو بابەتانەمان هەر هەن!- بەڵێ ئەمە بە تقلیدی حکمای غربە، ئەوان دینیان بە مانع زانی، لە دین دەرچوون...أمّا ئەوانەی مە بۆ؟! کێ منعی کردن لە وڵاتی کوردستان هەزار ساڵ زیاترە (علوم)ی طبیعەتو ریاضیەو فلکیە دەخوێندرێ، علمایە گەورەکانی ولی، بە دین، لەو علومانە (ید)ی (طولی)یان هەبووەو تألیفو حواشییان هەیە...). ب١٠، ص٦٩٠.

واتە ئەگەر دینی تێکدراوی نەصرانیی ڕێگەی لە ئەورووپاییەکان گرتبوو بەرەو پێشەوە بچن، خۆ دینی ئیسلام ڕێگەی بەرەو پێشچوونی لە شوێنکەوتووانی نەگرتوە، زانایانی ئێمە کامەیان زۆر بەدینو وەلیی بووە لە زانستو زانیارییەکانی: گەردووناسی، بیرکاری، سروشت ناسییدا، کتێبو دانراویان هەبووە، نەك ئیسلام ڕێگەی لێ نەگرتوون بەڵکو زۆریشی هانداون!

## ب- هۆکارەکانی بووژانەوەو هەڵسانەوەی مسوڵمانان:

لەوبارەشەوە مامۆستای گەورە لە تەفسیرەکەیدا شتی جوان باس دەکات بەتایبەت لە (بەرگی١٠ لاپەڕە٦٩٠،٦٩١) دەڵێ: (امە بە مقتضای سێ چوار ئایەت عمل بکا، لە دین و دنیا سەرفراز دەبێ و بەسەرئەکەوێ:

١- ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ ﴿١٤١﴾ البقرة ﴾.

مامۆستا زۆر باسی ئەم ئایەتە دەکات، دەڵێ: (خلاف)و (شقاق)ی أسلاف لە فکری خۆ ببەنەوە).

- زۆر ڕاست و بەجێیە، سەرنج بدەن ئەوەی لەم ماوەی پێشوودا ڕوویدا، کە ئەوەبوو کێشەو هەرا گەرم کرا لە نێوانی شیعەو سوننە، باسی دایکی ئیمانداران عائیشەو هاوەڵانی بەڕێز کرا -خوا لێیان ڕازی بێ-، کە دوور نیە جگە لە دەستی نەزانانەی هەندێك لە مسوڵمانان و ڕق و کینەی هەندێکیان، دەستی بێگانەشی تێدا بووبێ-.

٢- ﴿ ...إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ... ﴿١١﴾ الرعد ﴾، واتە: خوا واقیعی هیچ کۆمەڵگایەك ناگۆڕێ تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن.

جا دەڵێ: (ئەو عقائدە زائفە لەدڵ فڕێ دەن) -واتە ئەو بیروباوەڕە ساختەیە فڕێدەن، کە بە تەمای وەلیی و قوطب و شێخ و چاك و پیران تێبکەون، پشت بە خوا ببەستەو لەسەر پێی خۆت بوەستە، دین وات پێ دەڵێ-.

٣- ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ النجم ﴾، واتە: ئینسان هیچ شتێكی نایەتە دەست مەگەر بۆخۆی كۆشش بكات.

٤- (علمی و عملی، علما گەورەكان ببنە أولادی عصر، بۆ إدارە بە (بعض)ە قیودی (١٣٧٨) ساڵ لەمەوپێش، دەستو پای عباد نەبەستن ﴿ وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ... ﴿٦٠﴾ الأنفال ﴾، قوتی ئەمڕۆ لەگەڵ قوەتی دەوری شیرو تیرو بعیر جودایە).

واتە مامۆستای گەورە دەڵێ: پێویستە بە عەقڵێكی ئەمڕۆیی تەماشای ئایەتەكانی قورئان بكەین، بە تایبەت لە بواری ئیدارەو گۆڕینی واقیعی كۆمەڵگادا.

# تەوەری چوارەم و کۆتایی

## چەند ڕەخنەو تێبینیەك لەسەر تەفسیرەکەی مەلای گەورە

دیارە من تەفسیرەکەم بە چاوێکی ورد خوێندۆتەوەو بەڕاستی جگە لەو (١٥) خاڵەی کە لە تەوەرەی دووەمی بابەتەکەمدا باسمکردن، شتی دیکەی باشتریشی تێدایە، بۆیە من پێموایە هەرکەسێك بە وردی بیخوێنێتەوە، زۆر لێی بەهرەمەند دەبێ، چونکە بێگومان مامۆستای گەورە لە زۆر شتدا زۆر پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتۆتەوە، بەڵام کۆمەڵێك تێبینیش لەسەر تەفسیرەکەی هەیە، کە لێرەدا من (٧) تێبینی ئاماژە پێدەکەم:

١- کاردانەوەیەکی زۆر توندی تێدایەو، زمانێکی زبری بەکارهێناوە لە ڕەخنەگرتندا لە موسڵمانان بەگشتی و لە شێخ و صۆفی و دەروێش و ئەهلی طەریقەت و تەصەووف بەتایبەتی، واتە دەیتوانی هێندە زبر نەبێ لە ڕەخنەگرتندا، هەڵبەتە ئەو نموونانەی من هێناونەمەوە ئەوە هەڵمبژاردوون، ئەگەرنا بۆ زانیاریتان شتی وای تێدایە بە کەڵکی کۆڕو مەجلیس نایە!!

٢- هەندێك وشەو تەعبیری تێدا هەن، کە بۆ تەفسیری قورئان و بگرە بۆ کۆڕو مەجلیسیش شیاو نین، بەتایبەت هەندێك نوکتەو

قسەی خۆش کە زۆر زەقن، ئەگەرنا ئەسڵی قسەی خۆش‌و نوکتەی جوان، بێگومان کۆڕو مەجلیسیش دەڕازێنێتەوە، مادام لە سنووری شەرع دەرنەچێ، پێغەمبەری خواش ﷺ قسەو نوکتەی خۆشی هەبووە، بەڵام وەك گوتراوە: هەموو شتێك بە خوێ خوێش بە مانا.

٣- ڕەتکردنەوەی هەندێك فەرموودەی ڕاست (صحیح) هەر لەبەرئەوەی مانای هەڵەیان لێدراوەتەوە، یان لەبەرئەوەی لەگەڵ بەناو فەرموودەی دیکەی هەڵبەستراودا تێکەڵ کراون، واتە لەو بوارەدا فەرموودەی دیکەی هەڵبەستراویش هەبوون.

هەڵبەتە بەڕای من بێهێزیی مامۆستای گەورەش لە زانستی فەرموودە ناسیی (علوم الحدیث)دا، لەوبارەوە دەوری هەبووە، وەك ئەو فەرموودانەی باسی هاتنە خواری عیسا -سەلامی خوای لەسەر بێ-و هاتنی دەججاڵ دەکەن، کە مادام لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکانی فەرموودەدا هاتوون، وەك (صحیح البخاری، صحیح مسلم)و ئەوانی دیکە، وە لە هەندێك ئایەتیشدا ئاماژەیان پێکراوە، بە تایبەت هاتنە خواری عیسا -سەلامی خوای لەسەر بێ-، کەواتە ڕەتکردنەوەیان هەروا شتێکی ئاسان نیە، بەڵام دیارە مادام فەرموودەکان بە شێوەی (تواتر) بە ئێمە نەگەیشتوون، بەڵکو (آحاد)ن کە (یقین) نابەخشێ‌و تەنیا گومانی (راجح) دەبەخشێ، لەبەرئەوە کەسێك بڵێ: بڕوام بەو شتە نیە،نالێین: زیانێکی وا بە ئیمان‌و عەقیدە گەیشتوە کە پێی لە ئیسلام دەرچووە، بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی چاکی نەکردوە!

٤- تەبەننیکردنی هەندێك بیروڕای سەیرو بێهێز، لەبارەی تەفسیری هەندێك ئایەتەوە، بۆ نموونە: لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ النمل﴾، کە باسی (دابة الأرض) دەکاتو لەوبارەشەوە لە (صحيح مسلم)دا چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، بەڵام مامۆستای گەورە (دابة الأرض)ی بە خەڵکی فریودەرو بەو بەناو شێخی ساختە، کە کاتی خۆی گەڕاونو مریدو مەنسووبیان کۆکردۆتەوە، تەفسیر کردوەو لێکداوەتەوە، کە بێگومان ئەوە تەفسیرێکی دوورە!!

٥- باسکردنی هەندێك شتی تایبەتیو شەخصی، کە بۆ نێو تەفسیری قورئان ناشێن، واتە بۆ وێنە باسی زۆر شتی بەتایبەتی هی کۆیەو دەوروبەریو چنارۆكو ئەوانە دەکات، لەگەڵ زۆر شتی خزمانو دەوروبەرو فەقێو قوتابیانو خەڵکی دیاریکراو دەکات، هەڵبەتە هەندێك شتی بۆ پەند لێوەرگرتن باشە، بەڵام هەندێك شتی ورد بۆ باسکردن ناشێن، بۆ نموونە: دەڵێ ئەمڕۆ باران یان بەفری زۆر باری، یان باسی کەشو هەوا، وە هەروەها.

٦- پەلەکردن لە شیکردنەوەی هەندێك ڕووداوو واقیعی سیاسیدا، بۆ وێنە: مەدحی هەرکام لە (هیتلر، مۆسۆلینی، ئەتاتورك) دەکاتو بە پاڵەوانیان ناو دەبات، کە هەر کامێکیان دیکتاتۆرێکی بێڕەزا بووە، بەڵام دوایی کە وردەوردە جەنگی جیهانی دووەم گەرم دەبێو هەر کام لەو دیکتاتۆرانە دەردەکەون کە چ ماڵێکن، ئەمجار زەمیان دەکات! واتە بەر لە دەرکەوتنی حەقیقەتیان مەدحی کردوون کە دیارە لەوەدا پەلەی کردوە!

٧- ڕەشبینیی‌و نائومێدییەکی زۆر: بۆ وێنە: هەندێك جار دەڵێ: دەتوانم بڵێم یەك موسڵمانی ڕاست لە دونیادا نیە، کە قورئان‌و سوننەت‌و شەریعەتی هەموو قبووڵ بێ، یان جاری وایە دەڵێ: هەرگیز ئەو خەڵکە باش نابێ! ئاوا جۆرێك لە نائومێدیی پێوە دیارە.

گومانیشی تێدا نیە، کە ئەو خاڵە سەلبیی‌و بێهێزانەی تەفسیرەکەی مەلای گەورەو بەرهەم‌و کتێبەکانی دیکەشی کاریگەرییان هەبووە لە باش لێوەرنەگیرانی‌و ڕۆڵی پێویست نەگێڕانی لە کۆمەڵگای کوردەوارییدا.

بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ: کە مەلای گەورە، ئەگەر دەرفەتی پێداچوونەوەی تەفسیرەکەی ببووایە بێگومان گەلێك لە کەم‌وکوورییەکانی چاك دەکردن‌و ڕێك‌و پێکتری دەکرد[1]، دیارە هەر چۆنیش بێ ئەم و ڕەخنەو تێبینییانە لە بەهاو نرخی تەفسیرەکەی مامۆستاو ئەو ڕاستییە گرنگانەی گرتوونیە خۆی، زۆر داناشکێنن‌و کاری بەندەش بێ عەیب‌و هەڵە نابێ!



---

١) چونکە لە هەندێك شوێنی تەفسیرەکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پاکنووسی نەکردووەو هەندێك شتی بۆ پەراوێز نووس (مُحشّي) جێهێشتووە.

کۆتایی بابەتەکەشم بە سێ قسەی خۆشی مامۆستا دینم، کە پەندیان لێ وەردەگیرێ :

یەك: مەلا عبداللە ی بابیو موفتی بەغدا عبدالرحمن افندی:

مامۆستا دەڵێ: بابم بۆی گێڕامەوەو گوتی: من لە بەغدا بووم موفتی بەغدا (عبدالرحمن أفندی)، کە ئەو کاتە (نقیب)ی سەیدەکانی بەغداش بوو، لە کۆڕێکدا گوتی: مەلایانی کورد خوێندەواری باش نینو عیبارەتی عەرەبییان زۆر بەهێز نیە، منیش پێمگوت: چۆن؟ ئەویش شیعرێکی (الزهاوی) بۆ خوێندمەوەو گوتی: تەماشاکە ئەو شیعرە چۆنە؟ منیش گوتم: جا ئەو چ ڕەخنەیەکی تێدایە؟ ئینجا دوو سێ ئایەتی قورئانیشی خوێندەوەو گوتی: شیعرەکە لەگەڵ ئەو چەند ئایەتانە بەراورد بکە بزانە چۆنە؟ -بابیشم دەڵێ- پێم گوت: جا ئەوە گەورەترین مەدحە بۆ (زەهاوی)؟ گوتی: چۆن؟ گوتم: لەنێو قسەی عەرەباندا هیچ شتێکت دەستنەکەوت بەراوردی بکەی لەگەڵ شیعرەکەیدا، ئایەتی قورئان نەبێ؟!

دوو: وتاری مەلا عبداللە ی بابیو هایو هووی دەروێش:

دەڵێ: ڕۆژێك لە مزگەوتی کۆیە، بابم وتارێکی زۆر خۆشی دەخوێندەوە، بەڵام دەروێشێك هەر خەریکی نەڕەنەڕو هایو هووی بوو، لەبەرئەوە خەڵکەکە باش گوێ بیستی وتارەکەی بابم نەبوون، دوای وتارەکە بابم بانگی کرد گوتی: وەرە دەروێش ئەو هەموو نەڕەنەڕو هاتو هاوارەت چی بوو؟ ئەویش گوتی: قوربان لە ترس (خوف)ی خوا، بابیشم گوتی: دەی باشە، بەڵام تۆ خوای پەروەردگار

دەناسی؟ گوتی: بەڵێ بەڵێ قوربان، بابم گوتی: مادام دەیناسی هەندێکم بۆ باسی خوا بکە، دەروێش گوتی: من هەندە هەندەی نازانم، هەر ئەوەندە دەزانم کە سێ کەس ئەم دونیایەیان دروست کردوە، خوای تەعالاو پێغەمبەرو حەزرەتی غەوسی گەیلانی!

سێ: عەیب نەبێ:

مامۆستای گەورە باسی هەندێك جۆرە عادەتی خراپ دەكا لەنێو خەڵکدا، دەڵێ هەندێك كەس هەیە هەندێك قسە زۆر دووبارەو چەند بارە دەكاتەوە وەك : هەرامە، هین، وانێك، عەیب نەبێ، وە هەروەها، دەڵێ: ڕۆژێك كابرایەك هات بۆ لام، گوتی: مامۆستا عەیب نەبێ ژنێكم هێناوە، گوتم: ڕۆڵە جا بۆ عەیبە پیاوانمان هەموو ژن دێنن، گوتی: مامۆستا عەیب نەبێ پرسیارێكم هەیە، گوتم: جا عەیبی چیە ڕۆڵە من مەلاو تۆ عەوام پرسیاری خۆت بكە، گوتی: عەیب نەبێ ژنەكەم طەڵاق داوە، گوتم: جا ڕۆڵە بۆ عەیبە ژن طەڵاقیش دەدرێ، گوتی: ئاخر عەیب نەبێ چۆن طەڵاقەكەم چاك دەبێتەوە؟ گوتم: ڕۆڵە وشەی (عەیب نەبێ)، واز لێدێنی پرسیارەكە تەواو بكە، دەنا من لێت تێناگەم!!

بەهەر حاڵ مامۆستای گەورەی کۆیە (مەلا محمدی جەلیزادە) - ڕەحمەتی خوای لێبێ- زۆر قسەی خۆش و نەستەقی لە تەفسیرەکەیدا نووسیون، ئێمەش ئەو چەند قسەیەمان کردنە کۆتایی قسەکانمان.

وصلى الله على محمـــد وعلى آله وصـحبه أجمعين والحـــمد لله رب العالمين.

# بەرهەمەکانی دانەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خـوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩

تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

٨- ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون. چاپی ٣ /٢٠٠٥

٩- کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی٣ /٢٠٠٥

١٢- مسوڵمانی کامڵ/بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١٩٩٧/١

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئایندەیەکی گەش‌و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێروونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلام‌و کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتی، پاك‌وخاوێنی .

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشین‌و زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەج‌و عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەڕانەوە بۆ لای خوا (عزّ وجلّ) . چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسلام کێن‌و چۆنن ؟! چاپی ٢ / ٢٠٠٢

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچینە گرنگەکانی هەڵس‌وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یە، وە بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن‌دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی‌یەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٩- بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانجو هەڵوێستەکانی.    چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاساوو بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵیی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ .   چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانیو ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣٣- ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەت دا .   چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم .          چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز).   چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟!    چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟!          چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك.    چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە!      چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێ‌و چۆن دەکرێ؟ چاپی١/ ٢٠٠٢.

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر)   چاپی ٢/ ٢٠٠٦ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە.

٤٣- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

٤٤- ئیسلام‌و مسوڵمانەتی‌وکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمان‌و عەقیدەی‌ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمان‌و عەقیدەی‌ئیسلامی‌چی یەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتی دا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٧- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەت‌و لە پەرستراوێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٨- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّوجل)، کتێبەکانی خوا (عزّوجل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٩- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥٠- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندیی‌و دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠. چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥١- تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان. چاپی ١/ ٢٠٠٧، چاپی ٢/ ٢٠١١.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥٢- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی‌و لاسایی کردنەوەدا.

٥٣- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟

٥٤- سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونکردنەوەیەك.

٥٥- چۆنیەتی بوونە پێشەنگو بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی.

٥٦- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی.

٥٧- قوتابیانی زانیاری شەرعیی چەند سەرنجو ڕێنمایی یەك.

٥٨- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە.

٥٩- بانگەواز بۆ لای خوا .

٦٠- قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا پێویستە چۆن بنو چی بکەن؟!

٦١- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

٦٢- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

٦٣- خواناسیی، ئایین ، ئیمان.        چاپی ٢ / ٢٠٠٩ .

٦٤- واقیعی هەرێمی کوردستان ...دیدێکی ئیسلامییانە. چاپی١/ ٢٠٠٨ .

٦٥- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا. چاپی ١ /٢٠٠٨

٦٦- چۆن باشتر لە کتێبی بەڕێزی خوا بەهرەمەند دەبین؟! چاپی ١/ ٢٠٠٨.

٦٧- سروشتو پایەکانی خێزانو مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرعو عەقڵدا

تێبینی: ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٦٨- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ. چاپی ١/٢٠١٠، چاپی ٢/ ٢٠١١.

٦٩- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحی دا .

٧٠- کاری ئیسلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك.

٧١- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك.

٧٢- مەلای گەورە کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك.

## ئەو بەرهەمانەی لەژێر چاپن

١- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الأول.

٢- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان .

٣- خاتوو عائیشە دایکی بڕواداران.

٤- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟!

٥- زانایانی ئیسلام کێن‌و چۆنن؟ چاپی ٢.

## ئەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن.

١- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد ٢- ٨ .

٢- خووو ڕەوشتی ئیسلامیی.

٣- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەتدا. بەرگی دووەم.

٤- گرنگی‌و پێویستی پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوە.

٥- چەند دەرسێك لە: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، کە ئەگەر خوا تەمەن بدات هەموو قورئان تەواو دەکەین.

٦- ئیسلام‌و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی.

شایانی باسە کە قسەکردن لەبارەی تەفسیرەکەی جەنابی مامۆستا موحەممەدی جەلیزادە، ناسراو بە (مەلای گەورە)وە، کارێکی ئاسان نیەو زۆر هەڵدەگری، بەڵام وەك گوتراوە: ((ئەوەی هەمووی ناکری، واز لە هەندێکیشی ناهێنری))، ئینجا منیش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە تەفسیرەکەی مەلای گەورەم لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندوتەوەو بە وردیی سەرنجم داوە، بۆیە دەتوانم بڵێم:

ئەم وتارە هەرچەندە لەچاو تەفسیرێکی "دە" بەرگیدا کەموکورتە، بەڵام تا ڕاددەیەکی باش جەوهەرو نێوەڕۆکی باس و بابەتەکانی خستۆتە ڕوو و، فیکرو تێگەیشتنی مەلای گەورە لە دوو توێی لێکدانەوەی مانای ئایەتەکانی قورئاندا، بۆ گەلێك بابەت و مەسەلەی گرنگ و هەستیار ڕوونکردۆتەوە...

عەلی باپیر




نوسینگەی تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2518138
موبایل: 07504605122
www.tafseer-pub.com